# دیاری کوردەواری
# لە
# یادی پێغەمبەری ڕزگاری

مەولوودنامەی مامۆستایان
نامی ـ خالّ ـ شێخ نەسیم
شەمس ـ سەیید ـ شەڵماشی



دانراوی کومەڵی لە زانایان

# دیاری کوردەواری

## لە

# یادی پێغەمبەری ڕزگاری

مەولوود نامەی
ماموستا مەلا عبدالکریم
مدرس

مەولوودنامەی
ماموستا شەمس

❀

مەولوودنامەی
ماموستا شێخ محمدی
خاڵ

مەولوودنامەی
ماموستامەلامحمدی شەڵماشی

❀

مەولودنامەی
شێخ نەسیموو تەختەی

مەولوودنامە و
سەید عبداللە و بڵبەرێ

دانراوی کۆمەڵێ لە زانایان

پیا چوونەوە: عادڵ ساعدی

ساعدی، عادل، ۱۳۵۳ ـ گردآورنده.
دیاری کوردەواری لە یادی پێغەمبەری رزگاری / دانراوی کومەلی لە زانایان (تألیف جمعی از علما)؛ پیاچونەوە عادل ساعدی. ـ سنندج: انتشارات کردستان، ـ ۱۳۸.
۱۹۹ ص.
ISBN 964-6546-84-6 ۷۵۰۰ ریال

فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا.
کردی.
۱. محمد(ص)، پیامبر اسلام، ۵۳ قبل از هجرت ـ ۱۱ ق. ـ ـ میلادی. ۲. محمد(ص) ـ ـ پیامبر اسلام، ۵۳ قبل از هجرت ـ ۱۱ ق. ـ مدایح و مناقب، ۳، شعر کردی ـ ـ قرن ۱۴.
۴ شعر مذهبی ـ ـ قرن ۱۴. الف. عنوان.
۹ د ۲ س /۴/ BP ۲۵۹ ۲۹۷/۷۳۴
کتابخانه ملی ایران ۲۵۴۳۱ ـ ۷۹ م
محل نگهداری:

انتشارات کردستان
سنندج ـ پاساژ عزتی
تلفن: ۲۲۶۵۳۸۲

سنندج پاساژ عزتی انتشارات کردستان ☎ ۲۲۶۵۳۸۲

## دیاری کوردەواری
## لە یادی پێغەمبەری رزگاری

دانراوی کۆمەڵێ لە زانایان (تألیف جمعی از علماء)
بڵاوکەرەوە: ئینتیشاراتی کوردستان
نۆبەی چاپ: یەکەم ۱۳۸۰ هەتاوی
هەژمار ۵۰۰۰ دانە * چاپخانەی روستمخانی
پیت چنی: ئاشنا «سنە» ☎ ۲۲۶۵۹۱۸

| | |
|---|---|
| شابک: ۶ ـ ۸۴ ـ ۶۵۴۶ ـ ۹۶۴<br>ISBN: 964 - 6546 - 84 - 6 | نرخی<br>۷۵۰ تمەن |

# مەولوودنامە

دانراوی

# مامۆستا
# مەلا عبدالكريمی مدرس

ماموستای خويندنگای ئايينی ی

حەزرەتی گەيلانی لە بەغدا

١٤٠٢ی هيجری ١٩٨٢ ی ميلادی

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ الَّذِي نَوَّرَ الْأَرْضَ وَ السَّمٰاوٰاتِ، بِطُلُوعِ شَمْسِ فَخْرِ الْكٰائِنٰاتِ. وَ اَفْضَلُ الصَّلَوٰاتِ وَ التَّسْلِيمٰاتِ، عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ الْمَوْلُودِ عَلىٰ اَجْمَلِ الصُّوَرِ وَ اَكْمَلِ الصِّفٰاتِ، وَ عَلىٰ آلِهِ وَ اَصْحٰابِهِ وَ اَتْبٰاعِهِ الْمُهْتَدِينَ بِالآياتِ الْبَيِّنٰاتِ.

ئەی موسوڵمانینە! بزانن پێویستە هەموو موسوڵمانی خۆشەویستیی حەزرەتی پێغەمبەریﷺ زیاتر بێ لە گیان و ماڵ و منالّ و خۆشەویستانی خۆی، وەکو حەزرەت فەرموویەتی: قسەم بەو کەسە کە گیانی من وا لە دەستی قودرەتی ئەودا هیچ کام لە ئێوە ئیمانی تەواو نابێ هەتا حالّی وای لێ نەیەت کە منی خۆشتر بوێ لە نەفسی خۆی و باوک و دایکی و باقی ئادەمیزاد، هەموویان.

لە نیشانەی خۆشەویستیی ئەو پێغەمبەرە رەهبەرەیە لەم مانگەدا کە مەشهوورە بە (مانگی مەولوود) وە مانگی پەیدابوونی ئەوە، هەرکەسێ بەقەدەر حالّی خۆی شادمانی دەربڕی و جەژنی پەیدا بوونی ئەو بگێڕیو ببێ بە هۆی دڵشادیی موسوڵمانان.

لە (بخاری شریف) دا ئەگێڕیتەوە کاتی کە حەزرەتﷺ لە شاری مەککەوە کۆچی کردو گەیشتە شاری مەدینە، لە مانگی موحەررەمدا بیستی کە جوولەکەکان ڕۆژی دەەمی مانگدا بە ڕۆژوو ئەبن. ئەویش پرسیاری لێ کردن بۆچی لەو ڕۆژەدا بە ڕۆژوو ئەبن؟ عەریزان کرد لە شادیانەی ئەوەدا کە حەزرەتی (موسی عليه السلام) لەو ڕۆژەدا لە دەست فیرعەون ڕزگاری بووە. ئەویش فەرمووی: ئێمە نزیکترین بە (موسی) لە ئێوە، وە ئەم روژووە بۆ ئێمە باشترە.

زانایانی ئیسلام لەم فەرموودەیەوە وەریان گرتووە کە جوانە بۆ موسوڵمانان لە خۆشیی نیعمەتی گەورەدا جەژن بکەن، وە دڵشادیی خۆیان دەربڕن. دیارە

نیعمەتی پەیدا بوونی حەزرەتﷺ لە هەموو نیعمەتی گەورترە بـو مـوسولْمانان. کەواتە رەوایە بۆیان شەوی لە دایک بوونی حەزرەتﷺ بکـەن بـە جـەژن، وە دڵخوشیی خویانی تێدا دەر ببرن.

(امام سخاوی) رەحـمەتی خـوای لێ بـێ فـەرموویەتی جـەژنی مـەولوودی پێغەمبەرﷺ لە پاش سـێ قـەرن لە هـیجرەتی حـەزرەتەوە لە نـاو مـوسولْمانانا پەیدابووە، وە لەو تەئریخەوە تا ئەمرۆ موسولْمانان لە دێهات و لە شـارا هـەموو ساڵێ لە رۆژی دوانزەهەمی مانگی مەولوودا جەژنیان کردووە.

یەکەم پادشایەکی ئیسلام کە جەژنی مەولوودی کردبێ (مـظفر ابـو سـعید)ی پادشای هەولێر بووە. ئەم ذاتە ئەرجو مەندەگەلێ حورمەتی مەولوودی گرتووە، وە لە هەر جەژنێکی مەولوودا سێصەد هەزار دیناری خەرج کردووە، وە موسولْمانانی لە مەجلیسی مەولوودا کۆ کردوەتەوە.

(سَری سَقَطی) رەحمەتی خـوای لێ بـێ فـەرموویەتی ئـەو کـەسەی لە بـەر خۆشەویستیی حەزرەتﷺ جەژنی مەولوود بکا، بە رەفیقی ئـەو ئـەناسرێ لە بەهەشتا، چونکە حەزرەت فەرموویەتی: هەر کەسێ منی خۆش بوی، رەفیقی من ئەبێ لە بەهەشتا.

(جلال الدینی اسیوطی) رەحمەتی خوای لێ بێ فەرموویەتی لە هەرشوێنێکا مەولوودی پێـغەمبەر بـخوێنرێتەوە، مـەلائیکە بـە دەوری ئـەهلی ئـەو شـوێنەدا رائەوەستن‌وە داوای رەحمەتیان بۆ ئەکەن لە خوای تەعالا، وە لە لایەنی خـواوە رەحمەت ئەرژێ بەسەریانا، وە دڵیان بە نووری رحمەتی خوا رووناک ئەبێتەوە.

زانایانی دینی ئیسلام جەژنی مەولوودیان بـە شـتێکی نـەوظوهووری جـوان ژمـاردووە، وە فـەرموویانە پـێویستە لە بـەر حـورمەتی مـەقامی حـەزرەتﷺ حورمەتی مەجلیسی مەولوود بە دڵ و گیان رابگرین، وە بە بـخوور سـوتاندن و گولاو پرژاندن بۆن خۆشی بکەین، وە بە راگرتنی یاسای ئایینی پاکـی ئـیسلام بێخەوشی بکەین، وە مەیدانی بێ شەرمی و بێشەرعیی تیا نەدەین، بۆ ئەوە لە

پیروزیی یادی ئەو سەروەرە ڕەهبەرەوە دڵمان ڕووناک، وە ئەخلاقمان چاک، وە کردەوەمان پاک ببێتەوە، وە وەچەی تازەی موسوڵمانان ئەم ڕەوشتە لە ئێمەوە وەربگرن، وە لە نۆبەی خۆیانا حورمەتی ئەم ڕۆژە خاوەن سەعادەتە ڕابگرن..

ئەی پێغەمبەری ڕەهبەری ئیسلام　　بڕژێ بەسەرتا صەلات و سەلام
ئەی یادگاری نەتەوەی ئادەم　　بۆتۆ بوو دنیا دەرچوو لە عەدەم
دڵێ بە یادی تۆ نوورانی بێ　　لەگەڵ فریشتە ئەبێ بە هاودەم
چاوێ بڕوانێ بۆ ناوچاوانت　　وەر ئەگرێ نووری بارەگای قیدەم
ئەی پێغەمبەری ڕەهبەری ئیسلام　　بڕژێ بەسەرتا صەلات و سەلام

* * *

دڵــێ بــە یــادت بگەشێتەوە　　نەشئەی نووری حەق ئەبەخشێتەوە
بە یادی تۆوە سووتاوی جەفا　　بەرگی لە صەفا ئەپۆشێتەوە
دەمێ بگاتە تۆزی بەری پێت　　(شراباً طهور) ئەنۆشێتەوە
صەدجار بکوژرێ عاشقت بە تیر　　چاتر بۆ عەشقت ئەکۆشێتەوە
ئەی پێغەمبەری ڕەهبەری ئیسلام　　بڕژێ بەسەرتا صەلات و سەلام

* * *

بەکەس ناکرێ ئەنای صوورەتت　　کەشف ناکرێ (سرّ)ی سیرتت
سیما بە شەری و سیرەت فریشتە　　(روح القدس)ە هێزی غیرەتت
دنیا لەلای تۆ پەڕە کایەکە　　خودا ناسینە مایەی حیرەتت
ئەخلاقی بهرزە دەسمایەی ژینت　　عیلم و عیرفانە ڕێی بەصیرەتت
ئەی پێغەمبەری ڕەهبەری ئیسلام　　بڕژێ بەسەرتا صەلات و سەلام

* * *

ئەی دوڕی دەریای ئەسراری لەولاک　　بۆ خۆت نەوعێکی بە فەردێکی تاک
هەر ئەوەت لەگەڵ بەشەرا یەکە　　ئەتۆیش مەخلووقی بۆ خودای بێباک
لە هەر ئەرزێکا باسی تۆ بکرێ　　عەتری ئەگاتە سەر ئەوجی ئەفلاک

مـــەعنای شـــەپۆلی زانســـتی تـــۆیە    تـــەسبیحی خـــودا بـــە (مـاعرفناک)
ئـــەی پـێغەمبەری ڕەهــبەری ئـیسلام    بـــرِژێ بـــەسەرتا صـــەلات و ســـەلام

❊ ❊ ❊

لە بـــۆ ئـــازار و بـــێزاری دڵـمان
هـــەر لوطـفی تـۆیە ئـەبێ بـە دەرمـان
لە جــۆشی جــەفای نـــاباری زەمـــان
هـەر سـایەی تـۆیە چـەترە لە سـەرمان
لە تـــۆفی خـــۆفی زەلزەلەی مـەحشەر
هـــەر تکـــای تـــۆیە بـەرگە لە بـەرمان
کـــاتی تـــاریکی‌ی دل و دەروونـــم
ڕووناکی‌ی ڕووی خۆت دەر بخە بۆمان
ئـــەی پـــێغەمبەرێ ڕەهـــبەری ئـیسلام
بـــرِژێ بـــە سـەرتا صـەلات و سـەلام

❊ ❊ ❊

ئەی پـێغەمبەری شـیرن ڕەنگ و بـۆ    دەســتی هــانامان بــە دامـانی تـۆ
دنیای ڕوونـاکـم لێ بـووە بـە شـەو    مەینەت لە سەرم جـەم بـووە کـۆکـۆ
سایە شک نابەم لە گەرمای ئالاَی تۆ    مەگـەر سـێبەری کـالاَی ئـالاَی تـۆ
خۆت زویر مەکە لە بـێ شـەرمیمان    لابکـــــەرەوە ئـــــەمجارەش لە نـــۆ
ئـەی پـێغەمبەری ڕهـەبەری ئـیسلام    بـــرِژێ بـەسەرتا صـەلات و سـەلام

❊ ❊ ❊

لە حەدیثی قودسی یا هەیە خوای تەعالا فەرموویەتی من خەزێنەیەکی شاراوە بووم، ویستم بناسرێم، لە بەر ئەوە خەلقم دروست کرد تا بناسرێم هەروەها خوای تەعالا لە قورئانا فەرموویەتی من جنّ و ئینسم دروست نەکردووە بۆ ئەوە نەبێ کە عیبادەتم بکەن و بە حەق بمپەرستن. وە لە حەدیثی قودسیدا هەیە کە خوای تەعالا

فەرموویەتی بە پێغەمبەرﷺ ئەگەر تۆ نەبوویتایە وە لە بەر تو نەبوایە ئەرزو ئاسمانم دروست نەئەکرد.

زانایانی دین لە تەفسیری ئەم ئایەت و حەدیثانەدا فەرموویانە ئەو خوا ناسین و خوا پەرستی‌یەی کە شایانی ذاتی خودا بی هەر بۆ پـێغەمبەران بـووە، وە لە نـاو ئەوانیشا بەشی گەورە و پلی بەرزی هەر بۆ حەزرەتی (محمدالمصطفی)یەﷺ، وە هەر ئەو توانیویەتی ئەو خودا ناسینو لە خوا ترسان و خودا پەرستی‌یە بە تەواوی بەجێبێنێ. کەوابی قسەیەکی ڕاست و حەقیقەتە ئەمە کە ئەرز و ئاسمان لە بـەر حەزرەتی محمدﷺ دروست کراوە، وە لەم نوکتەوە دەر ئەکـەوێ کـە حـەزرەتی محمدﷺ پێشەوای پێغەمبەرانە و سەر حەلقەی ڕەهبەرانە. وە بە دەلیل ئـەشێ لە سەر ئەم مەقسەدە ئەمە کە حەزرەتی پێغەمبەر فەرموویەتی کاتێک کە من خەلاّتی پێغەمبەرایەتیم پێ درا، هێشتا گیان نەکرابوو بە بەری حەزرەتی ئادەمدا.

ڕیوایەت کراوە کـە نـوطفەی وجـوودی حـەزرەتﷺ لە لایـەن حـەزرەتی ئادەمەوە گەیشتووە بە حەزرەتی (شیث) سەلامی خوایان لێ بـێ، وە حـەزرەتی ئادەم وەصیەتی بۆ کردووە کە لە پشتی تۆدا کەسێکی بە قەدر و قیمەت و خاوەن هیممەت هەیە، کە واتە پێویستە لە ژنانی بە حورمەت و عیصمەت مـارە بکـەی. هەروەها ئەبێ تۆیش وەصیەت بکەی بۆ ئەولادی خۆت ئەوانەیان سەر بـەرز و دیارین لە ژنانی بە ئەخلاق مارە بکـەن، وە لە ڕشـتەی حـەزرەتی ئـادەما ئـەم وەصیەتە پشت بە پشت دەوامی کرد تا گەیشت بە باوک و دایکی حەزرەتﷺ.

وە هەر لە سەر شۆرەتی پەیدابوونی حەزرەت بووە لە ناو پێغەمبەرانا کاتێ کە حەزرەتی (ابراهیمی خلیل) خانووی (کعبةالله)ی دروست کرد لە شاری (مکّـەی مکرّمە) دا دوعای خیری کرد و لە خوا پاڕایەوە کە لە ناو ڕشتەی ئـەولادەکـانیا پێغەمبەرێکی بەرزی بە ناو بانگیان بۆ بنێری کە ئایەتی خودا بخۆینێتەوە بەسەریانا و پاکیان بکاتەوە لە ڕەوشت و خووی پەست و کردەوەی ناپەسەند، وە عـەقل و مەعریفەتیان پیشان بدا و دڵیان بە نووری ئیسلام ڕووناک بکاتەوە.

لە واقیعدا خودا دوعاکەی لێ قەبووڵ کـرد، وە لە نـەتەوەی ئـەوا حـەزرەتی محمدی ﷺ دروست کرد، چونکە ئەم ذاتە بڵەند صیفاتە نەسەبی ئەگا بە عەدنان، وە عەدنان ئەچێـتەوە سەر قەیدار کوڕی حەزرەتی ئیسماعیلی کوڕی حـەزرەتی ئیبراهیم صەلات و سلامی خوایان لێ بێ. وە خوای تەعالا دوو عالی مەقامی لە کوڕەکانی حەزرەتی ئیبراهیم کرد بە پێغەمبەر. یەکەم حەزرەتی ئیسحاق کە باوکی پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیلە، وە دووهەمیان حەزرەتی ئـیسماعیل کـە لە ڕشـتەی نەتەوەی ئەوا بە تەنیا حەزرەتی (محمدالمصطفی) پێغەمبەر بووە، کە ئەم پێغەمبەرە عالی جەنابە بە نووری ئایینی پاکی، وە بە بەرزیی ئەخلاق و ڕەوشتی چاکـی هەموو عالەمی ڕووناک کردەوە و کرا بە پێـغەمبەر و ڕەهبەر بـۆ هـەموو جـنّ و بەشەر، وە بوو بە خاتەمی پێغەمبەران و حـەلقەی ئـاخری دائـیرەی پـێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێ.

لە حەقیقەتدا ئەم ذاتە شایانی فەخر و عیزەتە لە لای هەموو عاقڵێک و هەموو خاوەن بیر و هۆشیارێک، وە بۆ ئەوە ئەشێ ڕەهبەرانی عالەم شانازی بـە شـانی بەرزیەوە بکەن، وە خولق و ڕەوشتی بەرز سەری ئێحتیرامی بۆ دابنەوێنێ کە وا ئەو ذاتە بوو بەهۆی تەواو کردنی و گەیاندنی بە هەموو لایەکی دنیادا. لەگەڵ ئەوەدا کە ئینسانی شارەزا کرد بۆ خودا پەرستی و دوور کوتنەوە لە خودپەرستی و لادان لە شێوەی پەرێشانی و بێئاگایی و مەستی.. هەروەها شارەزایشی کردن بۆ ڕێگەی ژیانی بە عیزەت و حورمەت، وە بۆ ڕاگرتنی ئوسوولی ژیـانی بـەشەریەت، وە بانگی کردن بۆ عیلم و صـەنعەت و دەسـتووری حـیکمەت و عـەدالەت، وە بـۆ خزمەتی حەق و حەقیقەت، وە بۆ صەبر کردن و خۆ ڕاگرتن لە عاستی ئـازار و مەینەت، وە بۆ دڵسوزی و میهرەبانی و دەست و داوین پاکی، بۆ بەرچاو ڕوشنی و دڵ ڕووناکی، وە بو دەوام و ئیستیقامەت لە سەر ڕێگەی سەعادەت، وە بۆ فیداکاری بۆ ئاسایشی نەبڕاوە، وە بو باوەڕ کردن بە تۆڵەی کردەوەی ئینسان، وە بۆ گەیشتن بە ڕۆژی نەبڕاوە بۆ پاداشی ئیشی نوقصان و پایەی کردەوەی خیر و ئیحسان، وە بۆ

ئەوە کە سەنگی ئینسان ئەوەندەی کردەوەی چاکەیەتی لە خزمەت کردنی حەق و حەقیقەتدا، وە ئەنجامی بە سراوە بە ساغیی کردارو بیر و باوەڕو نیاز و نی‌یەتیەوە. بە جۆرێ کە ئەگەر کەسێک بە بیری پاک و چاوی ڕووناک تەماشا بکا ئیمان دێنێ بەوە کە ئەم ذاتە بوو بە یەکەم ڕێگا پیشان دەری بەرزی ئادەمیزاد، وە ئەم جیهانەی هەڵسووڕاند بۆ ئەو باوەڕە کە هەر کەس بە قەدەر قابیلەت و تێکۆشانی خۆی سوودی نەبراوەی لێ وەربگرێ، وە بە هۆی ئەو سوودەوە لەم جیهانەدا بە ئەبەدی نەمرێ...

بە فەیضی بێ ئینتیها، بنێرە ڕەحمەت خودا
لە بۆ (امام الهدی) بۆ تاقمی سوعەدا
ئەی شاهی خۆش خوڵق و خوو، ئەی ماهی گوڵ ڕەنگ و ڕوو
ڕۆح و دڵ و لەش هەموو، بۆ تۆ بین بەفیدا
سەرگەردی هیممەتی تۆ ئاصەف کوڕی بەرخیا
شاگردی حیکمەتی تۆ صەف صەف گەلی سوعەدا
لە بەر مەلاحەتی تۆ یوسف قەڵەم بڕ بە کەف
لە بەر فەصاحەتی تۆ سەحبان نەما بۆی صەدا
بۆ سەعدی طالعی تۆ زوهرە بە دڵ موشتەری
لە نووری لامیعی تۆ قیبلەن لە بۆ ئیقتیدا
بە حوکمی ئیمانی تۆ، بە عیلم و عیرفانی تۆ
بە وەعظ و تبیانی تۆ، دڵ کەوتە ڕێی ئیهتیدا
بە حیلم و ئیحسانی تۆ، بە عەفوی ئاسانی تۆ
بە ڕەحم و ویجدانی تۆ، کز بوو هەوای ئیعتیدا
هەرچی هەبوون ئەصفیا لە ئەنبیا و ئەولیا
لە دائیرەی ئەذکیا لە ئاخر و ئیبتیدا

جـــوودو و جـــوودی هـــەموو، ســـیمای سـجوودی هـەموو
شـــەهد و شـــوهوودی هـــەموو بـــە یـومنی تـۆ دای خـــودا
لە ســـــەر عــــینایەتی تـــۆ ئــەهلی هــیدایــەتی تـــۆ
بـــــۆ نــــەشری ئـــایەتی تــۆ چــوونە گــەلی شــوهەدا
بـــــۆ (صــــاد)ی چـــاوانـــی تــۆ کــۆمەڵی لاوانــی تــۆ
وەک قــۆچی قــوربانی تــۆ خــۆیان ئــەکــرد بــە فــیدا
قـــــەسەم بــــە ئـــایینی تــۆ، بــە ســیرڕی یـــاسینی تــۆ
ڕاســـتە بــە نــاسینی تــۆ بــە شــەر ئــەگــا بــە خـــودا
چـــــۆن بـــاسی ئــەوصافی تـــۆ تــەواو ئــەکــا گــفتوگۆ
قـــــورئان لە بــــۆ نــەعتی تــۆ خـــولقی عـــەظیمە ئــەدا
خــــــولقی عــــەظیمی ئــــەتۆ، عــەقلی ســەلیمی ئــەتۆ
قـــــەلبی کــــەریمی ئــەتۆ، مــــوعجیزە بـــوون بـــۆ هـــودا
ئـــــەی ســــــروەری ئـــــەنبیا، ئـــەی ڕەهـــبەری ئــەتقیا
ئــــەی دوڵـــبەری ئـــــەصفیا (الخـــــیر مـــــنکم بـــــدا)
زەوی لە بــــــەحر و لە بــــەڕ هـــەردەو چـــیاو دەشت و دەر
پـــــڕ بـــــوو لە خـــێر و لە فــەڕ (مـــن کـــرم المـــقتدی)
تـــــیجارەتێکە وەهــــــا وێـــــنەی نــــیـیە بـــــۆ بــــەها
وەرگــــــرتنی مــــەیلی تـــۆ بــە ڕۆح ئــەگـــەر دەس بــدا
(نـــامی) لە ســـەر نـــامی تـــۆ لە بـــۆ ذەوقـــی جـــامی تـــۆ
لە بـــــر فــــەیضی عـــامی تـــۆ (یــطلب مــنک النــدیٰ)

## باسی تەشریف و تەوصیفی حەزرەتﷺ

لە ئایەتی بەقیمەتی قورئانی پیروزەوە دەر ئەکەوێ کە خوای تەعالا لە پێش زەمانی پێغەمبەرداﷺ هەر پێغەمبەریکی ناردبێ بۆ سەر هەر ئوممەتێک، عەهد و

پەیمانی لە گەڵدا کردووە ئەگەر لە زەمانی ئەوا حەزرەتی (محمد المصطفی) ڕەوانە بکرێت، ئەو پێغەمبەرە ئیمانی پێ بهێنێت و فەرمانی بەجێ بهێنێ و کۆمەکی بکا، وە بەڕاستی و دڵسوزی یارمەتی ی بدا بۆ ڕاگەیاندنی ئادابی دین. وە ئەگەر لە زەمانی ئەوا رەوانە نەکرا، ئەبێ ئاموزگاری ی ئوممەتەکەی بکا کە ئەگەر ئەوان بە خزمەتی گەیشتن ئیمانی پێ بهێنن و بە دڵ فەرمانی جێبەجێ بکەن. خوای تەعالا ئەمەی بۆ ئەوە کردووە کە ئەو پـێغەمبەرانـە لە پـایەی حـەزرەتی مـحمد ئـاگـادار بکـا و نموونەیەک لە گەورەیی و خۆشەویستی ی ئەویان پێ بنوێنێ.

هەروەها ڕیوایەت کراوە خوای تەعالا هەر کتێبێکی ناردبێ بۆ هەر پێغەمبەرێ، میقدارێکی لە نیشانەکانی پێغەمبەریەتی ی حەزرەتی محمد تیا بەیان کردووە، بۆ ئەوە کە ئەو پێغەمبەرانە باسی حەزرەتی مـحمد بـە شـیوەی مـژدە بگـەیەنن بـە ئوممەتەکەیان، وە هەموو لە صیفات و خولق و ڕەوشتی تێ بگەن.

لەو مژدە و بەشارەتانە ئەمەیە کە خوای تەعالا خیطاب بە حەزرەتی مـوسی سەلامی خوای لە سەر بێ ئەفەرموێت: تەجەللای من دەرکەوت لە کیوّی (طوری سیناء) دا بە ڕەوانە کردنی تۆ، وە نووری حەق دەر ئەکەوی لە کیوّی (ساعیر) بە ڕەوانە کردنی عیسی، وە بە ئاشکرا نووری حەق دەر ئەکەوێ لە کێوەکانی (فاڕان). فاران یەکێکە لەو سێ کێوانە کە باوک و با پیری حەزرەتﷺ لە ناویانا ژیاون، وە ئەشکەوتی (حراء) کە شوێـنی دانیشتنی حەزرەت بووە بە تەنیا بۆ بیر کردنەوە لە پەروەردگاری دنیا، لە ئەوزاعی ئەرز و ئاسمان و هاتوچوی ئەستێرەکان لە کیوّی فاران دایە.

وە لە تەوراتا هەیە خوای تەعالا فەرمانی دا بە ئیبراهیمی خەلیل لە سەر ئەوە کە ئیسماعیل و هاجەری دایکی ببا بۆ خاکی فاڕان و لەوی دایان بنی، وە مەعلوومی هەموانە کە حەزرەتی ئیسماعیل و دایکی لە (مکّەی مکرّمە)دا بوون و حەزرەتی ئیبراهیم لەوێ دایناون.

وە لە سیفری (شعیا)دا هەیە کە یـەکـێکە لە پـێغەمبەرانـی بـەنی ئـیسرائـیل،

عیبارەتیک کە تەرجەمەکەی ئەمەیە، ئەڵێ ئەی شەعیا من پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار ڕەوانە ئەکەم بۆلای ئادەمیزاد، وە بە یومن و پیروزیی ئەو پێغەمبەرە چاوی کوێر بینا ئەکەم، وە گوێچکەی کەڕ ئەکەمەوە، وە دڵی بە پەردە داپوشراو گۆشاد و ڕووناک ئەکەمەوە. جێگەی لە دایک بوونی ئەو پێغەمبەرە شاری مەککەیە، وە ئەو شوێنەی لە ئەنجاما هیجرەتی بۆ ئەکاشاری مەدینەیە، وە هێز و دەسەلاتی لە ولاتی شاما ئەبێ. ئەو پێغەمبەرە عەبدێکی خاوەن تـوکّل و دڵ ئەستوورە، وە هەڵبژێرراوو پایەدار و خۆشەویستە.

ئەوندە میهربانە لە جەزای کردەوەی خراپی خەڵکا خراپە ناکا، بەڵکو چاو پۆشی و لێ بووردنی هەیە. بە رەحم و ڕەوانە لەگەڵ موسوڵمانانا. ئەگری بۆ هەتیوێ کە لە باوەشی دایکیا بێ. زویر ئەبێ بە چاو پێ کەوتنی حەیوانێ کە باری گرانی لە سەر پشت دانرابێ. دڵ ڕەق نی‌یە، قسەی تاڵ نی‌یە. لە بازارا دەنگ بەرز ناکاتەوە، وە بە شتی ناشیرین و ناپەسنەند خۆی جوان ناکا. قسەی خراپ بە دەمیا نایەت. ئەوەندە ئارام و بە شەرمە ئەگەر ڕابووری بەلای چرادا گڕی ئەو چرایە نالەرێتەوە. ئەگەر بڕوا بە سەر قامیشا لە ژێر پێ‌یا دەنگی لێوە نایەت.

ئەو پێغەمبەرە ڕەوانە ئەکەم بە موژدەدەر بەو کەسانە کە فەرمان بەری خودان وە بە ترسێنەری ئەوانە کە بە گوێرەی فەرمایشی ئەو ناجووڵێنەوە ئوممەتی ئەو پێغەمبەرە ئەکەم بە چاکتر لە ئوممەتی هەموو پێغەمبەران چونکە ئەمر ئەکەن بە چاکەو نەهی ئەکەن لە خراپە، وە چونکە ساغ و خاوەن ئیخلاصن لە ئیمان و بیر و باوەڕدا وە لە بەجێ هێنانی ئەو کردەوانە دا کە پێغەمبەر ئەیان گەیێنێ بەوان..

ئەو ئوممەتە ئوممەتێکن تەماشای حیسابی شەوو ڕوژ و حەفتە و مانگ و ساڵ ئەکەن بۆ بەجێ هێنانی نوێژ و ڕۆژو و حەج و باقیی ئەو عیبادەتانە کە لەسەریانە، وە تەوحید و تەسبیح و تەکبیر و حەمد و ثەنای خوّم ئەهاوێمە دڵیانەوە، وە ئەمانە بەجێ دێنن لە مزگەوتا، وە لە مەجلیسا، وە لە شوێنی نووستنا، وە لە ماڵ و مەنزڵی خۆیانا.

ئەو ئوممەتە صەف بە صەف بەڕیز ڕائەوەستن لە مزگەوتا وەکو چون فریشتە لە ئەترافی عەرشا ڕیز ئەبەستن. ئەو ئوممەتە دۆستی منن، وە کۆمەکی دین و ئایینی منن. بەوان تۆڵەی تاوان وەر ئەگرمەوە لە تاوانباران، کە بتپەرستان و دوژمنانی خوا بە یەک ناسین و حەق پەرستین.

ئەو ئوممەتە نوێژ ئەکەن بە ڕاوەستان و دانیشتنەوە لە بەر ڕەزای من، وە رکووع و سجوود ئەبەن بۆ فەرمان بەردارای‌ی من، وە بە هەزاران لە ماڵی خـویانەوە در ئەچن بو غەزا لە بەر من. بە کتێبی ئەوان دوایی کتێبانی خۆم دەهێنم، وە بە دین و ئایینی ئەوان دوایی بە دین و ئایین ئەهێنم.

ئەو ئوممەتە لە کاتی توورەبوون و ڕق هەستانا (لا اله الا الله) ئـەکـەن، وە لە وەختی عاجزی و تێک چوونی ناو خویانا (سبحان الله) ئەکەن، وە دەست و پێ و دەم و چاوی خۆیان ئەشۆن بۆ عیبادەت کردن، وە کتێبی خۆیان لە بەر ئەکەن، ئەو ئوممەتە ئەکەم بە گەورەترینی ئوممەتانی هەموو پێغەمبەران، وە پایە و پلەی بەرز بۆ ئەو کەسانەیە کە لە سەر دین و ئایینی ئەوانن. ئەمە فەضلی خومە ئەیدەم بە هەر کەس مەیلم لە سەری هەبێ، چونکە من خاوەنی فەضلی گەورەم.

وە لە زەبووری حەزرەتی داووددا سەلامی خوای لێ بێ لە مەزمووری ژمارە چل و چوارا هەیە بە شێوەی خیطاب و قسە کردن لەگەڵ پێغەمبەری ئاخر زەمانا ئەڵێت: نیعمەت ئەڕژێ لە دوو لیوەکانتەوە بۆیە خوای تەعالا بەرەکەتی ڕژاندووە بە سەرتا هەتا ئەبەد. شمشیری خۆت رووت بکە چونکە شەریعەت و ئایینی تۆ لەگەڵ هەیبەتی دەستایە. تیرت تیژە، هەموو ئوممەت و میللەتی فەرمانت بە جێ دەهێنن.

وە لە بەعزێ کتێبی موعتەبەر و باوەر پێ کراوا هـەیە ئـەڵێت لەو کـاتەدا کـە پادشای بابل (بەختەنەصر) بەنی ئیسرائیلی‌یەکانی بە دیل گرت و بردنیە شـاری بابل لەوێ ڕای گرتن، شەویکیان بەختەنەصر خـەوێکی‌دێ، بـۆ تـەفسیری ئـەو خەوەی دامابوو کەسێ وای دەس نەئەکەوت کە بە جوانی تەعبیری ئەو خەوەی بۆ

بداتـەوە، تـا هـەندێ لە پـیاوە نـزیکەکـانی پـێیان وت کـە لە نـاو ئـەم دیـلە ئیسرائیلی‌یانەدا پیاوێکی مقدّس هەیە ناوی (دانیال)ە، وە ئەو ذاتە دەستی زۆرە لە تەعبیر دانەوەی خەودا. کە بەختەنەصر ئەم قسەیەی بیست زۆری پێ خۆش بوو، وە ناردی بە دوای حەزرەتی دانیالدا. کە تەشریفی هێنا بەختەنەصر وتی ئەی دانیال لە خەومدا تیمثالێکم دی لە شـێوەی ئـادەمیزادا، سـەری لە ئـاڵتوون بـوو، وە لە گەردنیەوە تا بیخی ڕانی برنجەی زەرد بوو، وە هەردوو قاچی لە ئاسن بوون. ئەم تیمثالە لە دەشتێکا بە پێوە وەستێنرابوو. هەروەها چاوم بە بەردیکی بچووک کەوت لەو دەشتەدا لە خۆیەوە زل ئەبوو وە بەرز ئەبووەوە تا ئەوەندە زل بوو، وە ئەوەندە بەرز بووەوە هەموو وڵاتی ڕوژەڵات و ڕۆژاوای داگـرت. بـەردەکـە لە کـاتی زل بوونەکەیداوردە وردە ئەیدا لە تیمثالکەوە وەک بەرد بدا لە گڵ وەها ئەی شکاند و دای ئەوەراند و دای ئەڕزاند. تکام ئەوەیە تەعبیری ئەم خەوەم بو لێک بدەیتەوە.

حـــەزرەتی دانـــیال فـەرمووی ئـەو تـیمثالە شـێوەی پـادشایەتی‌ی پـادشا بت‌پەرستەکانە. سەرەکەی کە لە ئاڵـتوون بووە، صـوورەتی شـەخصی تـۆیە کـە پادشایەکی بە قیمەت و بە هەیبەت و دەسەڵاتی.وە ئەو ئەندازەیەی کە لە برنجەی زەرد بووە صوورەتی بەشێکی‌ترە لە پادشایانی بت‌پەرست کە بە شێوە لە تۆ ئەچن، بەڵام وەک تو هێز و قیمەتیان نـی‌یە. دوو قـاچە ئـاسنەکـەیش صـوورەتی دوو چینی‌ترن لە پادشایان کە نە لە شیوە و نە لە هێز و تواناادا لە تۆ ناچن. ئەو بەردە بچووکەش کە لە دەشتەکەدا دیوتە، بە پێی ئـەوەی کـە لە کـتێبی ئـێمەدا هـەیە صوورەتی پێغەمبەرێکە لە نەتەوەی حەزرەتی ئیسماعیل لە وڵاتی حیجازا پـەیدا ئەبێ و تەرەقی ئەکا و بەرز ئەبێتەوە و دین و ئایینی ئەو خور هەڵات و خۆرنشین ئەگرێتەوە و پادشا کافر و بت‌پەرستەکان لە سەر دەستی ئـەوو ئـوممەتی ئـەودا ئەفەوتین.

وە چەند سەیرە بەرد زل بـبێ و وڵات پـڕ بکـا و تـیمثالی ئـاسن بشکـێنێ، بەرزبوونەوەی ئەو پێغەمبەرە و زاڵ بوونی بە سەر پادشایانی دنیادا ئەوەندە سەیرە،

وە ئەبێ بە هۆی ئەوە کە ئینسان سەری سڕ بمێنێ، بەڵام سەر سڕمان لە لای ئێمەیە، وە بۆ خوداوەندی عالەم هەر شتێ کە ئارەزووی لێ بێ ئاسانە. شەریعەتی ئەو پێغەمبەرە هەرچەند بەرز ببیتەوە، ئەوەندە ئایینی کافران و بتپەرستان دائەنەوێ و نیشانەی نامێنێ.

بەختەنەصر هەر چەند ئەم تەعبیر لێ دانەوەی خەوکەی پێ ناخۆش بوو، وە لە سەردڵی گران بوو، بەڵام بە عەقلیا چوو، وە گەلێک ئیکرامی حەزرەتی دانیالی گرت و میهرەبانیی لەگەڵ نواند.

وەلە ئینجیلا هەیە کە حەزرەتی عیسی سەلامی خوای لێ بێ فەرمووی بەوانە کە پەیڕەویی ئەویان ئەکرد: داوا ئەکەم کە خوای تەعالا پێغەمبەریکتان بۆ بنێرێ کە ئەنا و ستایشی خوا ئەکا و ئوممەت ڕزگار ئەکا لە زەحمەت و مەینەت و لەگەڵ ئوممەتدا ئەمێنێتەوە تا ڕوژی قیامەت. یەعنی ئایینی ئەو تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام ئەبێ.

ئاشکرایە کە پێغەمبەرێکی وەها کە پاش حەزرەتی عیسی هاتبێ بەم نیشانانەوە، بریتییە لە حەزرەتی محمدﷺ وەکو خوا لە قورئانا بە زوبانی حەزرەتی عیساوە ئەفەرمۆیت ئەی گەلی بەنی ئیسرائیل من پێغەمبەری خودام بۆلای ئیۆە، وە موژدەتان ئەدەمی بە هاتنی پێغەمبەرێک لە پاش خۆم کە ناوی (احمد)ە و حەمد و ئەنای خوا زۆر ئەکا.

خولاصەی کەلام لە هەموو کتێب و ئەسفاری پێغەمبەرانی ڕابوردوودا تەعریفی حەزرەتی (محمدالمصطفی) ﷺ بەیان کراوە، وە نیشانەی خۆی و ئوممەتی ڕوشن کراوەتەوە، وە پێغەمبەران بەپێی ئەو نیشانانە مژدەی هاتنی حەزرەتی محمدیان داوە بە ئوممەتەکانیان.

بەڵام ئەو خاوەن کتێبانە لە پاش زەمانی پێغەمبەرەکانیان گەلێک لەو نیشانانەیان لە بەر حەسوودی لابردووە و هەندێکیان گۆڕیوە بە بارێکی‌تردا، وە هەندیکی تریشیان بە خیلافی واقیع وە بە درو مەعنا لێداوەتەوە. هەندێکیشی هەروەها

ماوەتەوە، وە لە بەر زۆری و ڕووناكی نەیان توانیوە دەستی بۆ بەرن. وە ئەگەر ئینصاف و ویجدان بێتە پێشەوە هەموو ئەهلی كیتاب بە ناچاری مەجبووری ئەوە ئەبن پێ‌ی لێ بنێن كە خاوەنی ئەو نیشانانە حەزرەتی محمدەﷺ، وە ئەم ذاتەیە مژدەی هاتنی دراوە، وە پێغەمبەری ئاخرزەمانە، وە لە پاش ئەو پێغەمبەری‌تر نابێ و دینی ئەو هەموو دینە پێشووەكان نەسخ ئەكاتەوە، وە بە تەنها ئایین و میللەتی ئەو بە حەق و راستی ئەمێننەوە لە سەر ڕووی زەویدا.

ئەو مژدە و بەشارەتانەی كە باسمان كردن بە جۆرێک لە ناو یەهوودی و نەصرانی‌یەكانا بلاو بووبوونەوە، یەهوودی‌یەكانی ولاتی حیجاز هەر كاتیک كردەوەیەكی ناپەسەندیان لە ئەهلی ئەو ولاتە ئەبینی هەرەشەیان لێ ئەكردن بە نزیک بوونەوەی زەمانی پێغەمبەرﷺ وە ئەیان‌وت نزیكە ئەو پێغەمبەرە مژدە پێ دراوە بێت وە عەدالەت لە ولاتا بلاو بكاتەوە. ئەوسا مەجالی ئەم جۆرە كردەوانە نامێنێ و حەقی هەموو ئیشێكی خراپتان لێ ئەسێنێ. لەگەڵ ئەوەشدا كە حەزرەتی پێغەمبەرﷺ هاتە پێشەوە، ئەو كێتابی‌یانە كە زوو مژدەیان ئەدا بە هاتنی، كەوتنە دەربرینی كینەو بەربەرەكانێ، وە هەموو جورە پیلانێكیان بە كار هێنا بۆ فەوتاندن و كز كردنی ئیسلامەتی و موسوڵمانانا. بەلام لەگەڵ ئەو هەموو تەقەلایەشیاندا خوای تەعالا هەر یارمەتی‌ی موسوڵمانانی‌دا، وە دینی ئیسلام پەرەی سەند و بە جیهانا پڕتەوی خۆی بلاو كردەوە، وە عالەمی بە ڕوشنایی ئیسلام ڕوشن كردەوە و ئەو كافرە خاوەن كینەو عەنادانە لە ناو چوون چونكە خوا غالبە بەسەر ئیشی خویدا، وە مەیلی لە هەرچی هەبی بە ئارەزووی خوی جێ بە جێ‌ی ئەكا.

ئەی كانی كەرەم، سەروەری دیوانی مەحەببەت
ئەی شەمسی عەلەم، ڕەهبەری كەیوانی مەحەببەت
ئەی نوورو ضیای ئەرز وهەموو چەرخی سەماوات
ئەی شەوق و بەهای ئادەم و ئەدیانی مەحەببەت

ئــەی طــالیعی بــورجــی شــەرەفی عــیزەت و تــەقوا
ئــەی جــامیعی فــەوجی ســەلەفی بــابی مــەحەببەت
تــۆی مــەركەزی بــۆ دەورو ئــەتۆی قــوطبی كــەمالاَت
تۆی شەمسی صەفای حیكمەت و تۆی لوببی مەحببەت
تــا دەم بــە بــەهای نــاوی ئــەتۆوە بــوو بــە ســەریا
ئــەڕژا لە ســەمای فــەیضەوە بــارانــی مــەحەببەت
ئــەو نــووحە كــە ڕزگــار بــوو لە تــۆفانی هــیلاكــەت
هــەر غــایە نــەهەنگێ بــوو لە دەریــایی مــەحەببەت
ئــەو ئــاگــرە وابــوو بــە گــولستانی بــراهــیم
مــەقسەد لە گــوڵی تــۆ بــوو لە نــاو بــاغی مــەحەببەت
یــەعقووبی نــەبی صــەبری جــەمیلی لە دلاَ بــوو
چــۆن پــڕ بــوو دڵــی ئــەو لە گــوڵی بــاغی مــەحەببەت
ئــەییووبی نــەبی دەرد و جــەفای بــرد بــە وەفــای تــۆ
یۆسف بە هەوای تــۆ وەری گــرت نــووری مــەحەببەت
مــووسایەدی بــەیضای لە چــرای طــەلعەتی تــۆ بــوو
عــیسا بــە صــەفای تــۆ گــەیی‌یە شــۆری مــەحەببەت
پــەی‌پەی بــە قــودوومی شــەرەفت مــوژدە ئــەباری
وەک ســەیلی بــەهاری لە ســمای نــووری مــەحەببەت
مــووسا بــوو كــە ئــەیفەرموو نــیشانە و صــیفەتی تــۆ
داوود بوو كە ئــەی خــوێندەوە مــەزمووری مــەحەببەت
عــیسا بــوو (مــبشّر) بــە عــەلاماتی (مــحمد)
(احــمد) لەقــەبی فــەخرە لە ئــایاتی مــەحەببەت
شــەعیا بــوو ئــەهاتە ســەری ئــایاتی ســەماوی
بــۆ نــەعتی نــەبی و تــاقمی ڕایــاتی مــەحەببەت

سـیفرێ نـەبوو بـێ دەفـتەری ئـەوصافی (مـحمد)
عـەصرێ نـەبوو بـێ عـەنبەری ئـینصافی مـەحەببەت
نـووری کـە خـودا داویـە بـە سینە و دڵـی پـاکـان
جـیلوەی دڵـی تـۆ بـوو بـە فـیووضاتی مـەحەببەت
لوقـمانی حـەکـیم لوقـمە خـۆری خـوانـی کـەماڵت
سـەحبان بـە بـەیان کـەوتە بـە سـەرهاتی مـەحەببەت
حاتەم بە تەمای خوانـی سـەخا و بـەخششی تـۆ بـوو
کـەوتە کـەرەم و نـەشری شـیعاراتـی مـەحەببەت
ئـەم بـەندە کـەوا بـەندی هـەواتـە بـە دڵـی خـۆی
بۆ قاپی‌یەکەت هـات بـە تـەمای وەجـد و مـەحەببەت
یـەک قـەترە لە بـارانـی سـەمای صـەفوەتی تـۆ بـوو
یەک نم لە هەوای هەوری وەفا و ڕوشـد و مـەحەببەت
بـێتوو بـتکێتە دڵـی پـەژموردەیی زاری
(عـیناً) وەکـو سـەرچـەشمە ئـەدا ئـاوی مـەحەببەت
عـادەت لە کـەریمانەوە ئـیحسان و عـەطایە
ئـەی شـاهی خـەطاپۆش و عـەطابەخشی مـەحەببەت
با لوطف و عەطات بێت بە تکای عەفوی خـەطای مـن
بۆ (نـامی) یـەکـەی مـانی‌یەکـەی نـەقشی مـەحەببەت
ڕەبـبی بـڕژێنە لە سـەماواتـی مـەحەببەت
بـارانـی صـەفا بـۆ دڵـی سـوڵطانی مـەحەببەت

❊ ❊ ❊

لە کاتێکا خـوای تـەعالا ویسـتی ڕووی زەوی بـە چـرای خـاوەن صـەفای ڕوخساری نازداری ڕەهبەری عالەم ڕووناک بکاتەوە، وە ئەم جیهانە بە پرتەوی پێغەمبەری سەروەر پرشنگ‌دار بکا، وە دڵی گروهی ئادەمیزاد بە چرای ئیسلامەتی

نوورانی بکا دڵی (عبداللە)ی باوکی پێغەمبەری، کە یەکێک بوو لە دە کـوڕەکـەی (عبدالمطلب)وە لە پیاوە خاوەن شان و شکوکانی تایەفەی قورەیش بوو، بزواندەوە و خستیە سەر سەودای ژن هێنان، وە دایکی تێ‌گەیاند کە لە ناو تایەفەی قورەیشدا بگەرێ و ژنێکی بە قەدر و حورمەتی بۆ بدۆزێتەوە. دایکی گەلێک گەڕا تا (آمنە)ی کچی (وهب)ی کوڕی (زهرە)ی کوڕی (عبدالمناف)ی بۆ دۆزی‌یەوە کـە لە نـاو هەموو ژنانی ئەو ڕۆژەی تایەفەکەیدا هەڵبژیرراوو دیاری بوو.

لە پاش بە جێ‌هێنانی ڕەسم و یاسای خۆیان، بە شەرەف و حورمەت مارەیان بڕی لە (عبداللە) و گوێزایانەوە. وە لە پـاش ئـەوە کـە نـووری نـوطفەی پـاکـی حەزرەتﷺ لە لایەنی (عبداللە)وە نەقڵ بوو بو لای ئامینە، لە پیروزی‌ی ئەم ذاتە خاوەن هیممەتەوە سیما و شیوەی ئامینە ڕوژ بە ڕوژ بە نوعێ ئەگۆڕا، وە نووری حەزرەت لە ناو چاوانیا ئەدرەوشایەوە، بە جورێک کە هەموو ئینسانێکی ژیر تێ ئەگەیشت ئەو ژنە حامیلەیە بە ذاتێکی پایەبەرزی خاوەن هیممەت و قیمەت، وە ڕووی دنیا بە هۆی ئەو ذاتەوە ڕووناک ئەبێتەوە.

ڕاستی‌یەکەی وەک چۆن لە بەرەبەیانا دنیا ڕوشن ئـەبێتەوە، وە بـای نـەسیم ئەشنێتەوە، گەلێ وەزعی ئەم دنیایە گوڕاو ڕووی کردە خۆش‌بوون، یەعنی زستانی تاریکستانی تەواو بوو، ئەمجارە نوبەی نەسیمی صافی بەهار و جوان بوونی دنیایە بە گوڵ و گوڵزار.

لە پیش لە دایک بوونی حەزرەتداﷺ چەند شتێکی سەیر لە دنیادا دەرکەوت کە هەر کەسێکی ژیر تەماشای بکردنایە ئەیزانی دنیا بـە ڕێ‌ی گـوڕانـەوەیە بـە بارێکی جواندا، وە نزیکە وەزعێکی وا بێتە ناو ئادەمیزاد لە تاریکایی شەقاوەت و زەحمەتەوە بکەوێتە ڕوشنایی بەختیاری و ڕەحمەت.

یەکێ لەو شتانە ئەمەبوو پەنجا ڕۆژ لە پیش پەیدا بوونی حەزرەتا (أبرهة) ناوێ حەبەشەیی کە فەرمانڕەوای وڵاتی یەمەن بوو تووڕە بوو لە ئەهلی مـەککـە و لە خانووی (کعبةاللە) کە قیبلەگای ئەهلی مەککەو هەموو عەرەب بوو، وە سوپاهێکی

زۆر گەورە و چەند فیلی بەهێز و هەڵمەتی ریکخست بۆ داگیر کردنی وڵاتی حیجاز و وێران کردنی (كعبةالله)، وە بەم مەبەستە ناپەسەندەوە هات وە نزیکی شاری مەککە بوەوە.. وە لە نزیکی مەککەدا ئۆردووگای هەڵدا، وە گەلێ وشتر و حەیواناتی عەرەبی بە تالآن برد کە هەندێکیشی هی (عبدالمطلب)ی باپیری حەزرەت بوو. لەو کاتەدا (عبدالمطلب) ڕۆیشت بە دەمیەوە بۆ ئەوەی لەگەڵیا رێک بکەوێ و حەیوان و وشترەکانی خۆی و خەڵکەکەی‌تر وەربگرێتەوە و لەو بیرە شوومە پەشیمانی بکاتەوە.

کە نزیک بوەوە لە ئیستیراحەت گاهەکەی ئەبرەهەو، ئەبرەهە چاوی پێ کەوت، زۆر بە پیاوێکی بە قەدر و حورمەت و بەرز و بە هیممەت هاتە پێش چاوی، وە زۆر قەدر و حورمەتی عبدالمطلبی گرت و بە خێرهاتنی لێ کرد. عبدالمطلب لە پاش ئەوە کە حەسایەوە تکای لە ئەبرەهە کرد سوپاکەی بگێڕێتەوە و نەیەتە بەسەر وڵاتی مەککەدا، وە ئەو حەیوان و وشترانەی بردوویانە بیداتەوە. ئەبرەهە وتی زۆر سەرم سوڕ ئەمێنێ کە وا تۆ لە جیاتی‌ی ئەوەی لە بابەتی پاراستنی خانووی کەعبەوە تکام لی بکەی کە قیبلەی عەرەب و عیبادەتخانەی ئیوەیە، تکای گێڕانەوەی حەیوان ووشترەکانتان ئەکەی! عبدالمطلبیش وەرامی دایەوە کەوا هەر شتێک خاونێکی تایبەتی‌ی هەیە. ئێمە خاوەنی وشتر و حەیوانەکانین، مالّی کەعبەیش خاوەنێکی بە دەسەلاتی هەیە کە خوایە، وە ئەو خانووی خۆی ئەپارێزێ. لە ئەنجاما ئەبرەهە بڕیاری‌دا کە وشتر و حەیوانەکانیان بداتەوە، بەلاّم ئەبی مالّی کەعبە بڕووخێنێ. وە بەم نیازە ناشیرینە فەرمانی‌دا سوپاکەی بەرە و کەعبە بکەوێتە ڕێ و، فیلەوانەکان ئاگادار کران کە فیلەکانیان ئامادە بکەن و بڕۆن بۆ مەککە بۆ ڕووخاندنی خانووی کەعبە، بەلاّم خوای تەعالا بۆ پاراستنی مالّی خۆی کە ئەبێ بە جێگای عیبادەتی بەحەق، وە بۆ دەرخستنی پایە و گەورەیی مەقامی حەزرەت ﷺ کە لەو نزیکانەدا دێتە دنیاوە، فیلەکانی مەنع کرد لە ڕۆیشتن بۆ مەککە، وە هەرکاتێ کە فیلەوانەکان بەرە و مەککە لێیان ئەخوڕین، ئەوان

ئەنووستن و جووڵـەیان نەئەکرد، وە کە ڕوویان وەر ئەچەرخاندن لە مەککـە بـە جورێک ڕایان ئەکرد کە فیلوانەکان پیایانا نـەئەگـەیشتنەوە. فـیلەوانـەکـان لەم کارەساتە سەر سام بوون و سوپایەکەیش سەرگەردان بوو، وە لە هەمان کاتا خوای تەعالا بۆ بەرباد کردنی ئەو سوپایە تاقمێک پەلەوەری لە لای دەریای سوورەوە ڕەوانە کرد، وە هەریەکی لەو پەلەوەرانە هـەندێک گـلێ رەقـیان بـە دەنـووک و چنگەوە بوو، کە گەیشتنە ڕاسەری سوپایەکە ئەو گلاّنەیان فڕێ ئەدا بە سەریانا، وە بە قودرەت و تەوانای خودای عالەم ئەو گلّە بە سەر هەر کەسیکدا ئەکەوت وەکوو ئاگرێکی تیژ سەری ئەو کەسەی ئەسووتاند و کاریشی ئەکردە ناو سکـی، وە لە ماوەیەکی کەمدا ئەو کەسە ئەمرد. بەم جۆرەوە بـەم شـێوە سـەیرە ئـەو سـوپایە پەریشان بوو، وە کومەڵێکی زۆریان مردن، وە بەم کارەساتە ئەو سوپایە تێکچوو، وە لە بەجێ هێنانی دڵخوازە ناشیرینەکەی ئەبرەهە پاش کەوت.

لە پاش ئەم کارەساتە عەجایبە کە خودا پیشانی وڵاتـی حـیجازی دا، وە بـە تایبەتی دڵی خەلکی مەککەی پێ خۆش کرد، ڕۆژ بە ڕۆژ وەزعی ئەهلی مەککە خۆش ئەبوو وە نیشانەی ڕووناکی‌یان بۆ دەر ئەکەوت.

هەروەها ئەو ساڵە هەرچەند ساڵێکی نەهات و گرانی و بێبارانی بوو، هەر بە هۆی پیروزی‌ی هاتنی حەزرەتەوەﷺ گوڕا بە ساڵێکی خۆش و ساڵێکی هەرزانی بە نەوعێ کە ئەهلی ئەو وڵاتە ئەو ساڵەیان ناو ئەبرد بە ساڵی شادمانی و خۆشی.

یەکێ‌تر لەو شتانە ئەوە بوو کە خوسرەوی پەرویز پادشای ئـێران لە شـەوی پەیدابوونی حەزرەتاﷺ لە خەویا دیتی ئینسـانێک بە هیرش و هـەرەشەوە هـاتە سەری و پێی وت «زوو بە زوو هەرچی وڵات لە دەستایە بیدە بە دەستی مەردی عەصا بە دەستی حەق پەرستی ئارام و هێمنەوە». خوسرەو کە لە خەو خـەبەری بووەوە، گەلێک پەرێشان بوو بەو خەوەی کە دیویەتی، وە کەوتە دڵیەوە کە مەعنای ئەو خەوە ئەوەیە فەرمانداری و پاشایی لە بنەماڵەی ساسانیدا نامێنێ و ئەکەوێتە دەستی کەسێ کە بە تەبیعەت ئارەزووی لە ئازار و خوێن ڕژاندن نی‌یە.

وە هەر لەو شەوەدا كە ئەم خەوەی چاو پێ كەوت قەسری حوكوومەتەكەیشی كەوتە زەلزەلە و تەكان، وە چواردە تاقی لێ ڕوخا، بەم كارەساتە زیاتر لە خوەكەی دڵ گران بوو چونكە لەگەڵ مەعنای خەوەكەیدا نزیک بوو، وە هەر لەو سەردەمەدا گەورەی ئایینی مەجووس لە خەودا چاوی پێ كەوت كە وا تاقمێک وشتری سەر خۆش لەگەڵ ڕەوگی لە ئەسپی سەركێش لە ڕووباری دەجلە بەرە و خور هەڵات پەڕینەوە و بە وڵاتا بڵاو بوونەوە بۆ ئیشارەت بەوە كە سوپای وشتر سوار و ئەسپ سوار لە جەنوبەوە دین و وڵاتی عەجەم داگیر ئەكەن.

یەكیكی تر لەو شتانە ئەوە بوو لە شەوی پەیدا بوونی حەزرەتدا ئاگری عیبادەت خانەی مەجووسەكان لە شیراز كە هەزار ماڵ پاسەوانی بە دەورابـوو، وە نـەیان ئەهێشت بكوژێتەوە، لەو شەوەدا فەراموشیان كرد و كوژایەوە، بۆ ئیشارەت بەوە كە ئایینی مەجووس لە سەر ئەرزدا نامێنێ. دووشتی تر لەو شتانە ئەوە بوو كە ئاوی سەماوە لە وڵاتی شام وە دەریاچەی ساوە لە خاكی فەلەستین كە لە ژێر دەسـتی حوكوومەتی ڕومدا بوون، وشک بوون و بە ئەرزا ڕۆ چوون بۆ ئیشارەت بە نەمانی فەرمانی ڕۆم لە وڵاتی شامدا. یەكێكی تریشیان ئەوە بوو كە هەرچی بت لە ماڵی كەعبەدا دانرابوون وە عەرەبەكان ئەیان پەرستن، لە شەوی پەیدابوونی حەزرەتدا هەموو بە ڕوودا كەوتن.

خولاصە گەلی نیشانەی گەورە لە ڕووی دنیادا دەر كەوت كە ئیشارەت بوون بە گۆڕانی زەمانی گومرایی و نزیک بوونەوەی ڕۆژی بەرزیی ئایین و حەق پەرستی و ڕاستی و بەختیاری، بە لە دایک بوونی حەزرەتی محمدﷺ.

ڕەبـبی بـینێرە صـەلاوات      بۆ حەبیبی خۆش لەقای تـۆ
ئەوەندە لایق بێ بە فـەضڵت      تـا ئـەمێنێتەوە بـە قـای تـۆ

❊ ❊ ❊

گیان فیدای عـەرعەری بـاڵای تـۆ      دڵ فـیدای سـێبەری ئـاڵای تـۆ
پـادشایە ئـەوەی بـێتە بـەر      سـێبەری بـاڵی هـومای تـۆ

شـاد ئـەبێ ئەو کەسەی ببینێ — هەیئەت و صوورەت و سیمای تۆ
بۆ کەسێ بێتە جێ حوضوورت — تـاجی عـیززەتە لیقای تۆ
شـەونمی فـەیضی تـۆ شـیفایە — بـۆ جـەفاکێشی وەفـای تـۆ
مـەرهەمی زامـی دڵانـە — چاوی ئاهووی بێ خەتای تۆ
نـیو نـیگای تـۆ بـە میهربانی — کـافی‌یە بـۆ مـوبتەلای تـۆ
فەجری تەئریخی تۆ کە دەر کەوت — شـەوقی داوە لە بەر صەفای تۆ
ڕۆژی تـابان لە چـەرخی بەرزا — بـە هـەرەگـر بوو لە ضیای تۆ
قـودسی‌یانی مـەقامی عـیززەت — (قـاب قـوسین) لە لای تـۆ
(یـا مـزمل) بـۆ خـەڵاتت — (یـا مـدثر) بـۆ کـاڵای تـۆ
(یـاسین) لەقـەبی تـەشریفت — (طـاها) بـۆ بـەدری گـۆنای تۆ
بـە هـەموو ڕەهـبەرانی عـالەم — هـاتنە جـێگەی ئـیقتیدای تـۆ
قـەت تـەواو نـابێ تـەعریفت — (خـلقٌ عـظیم) ثـەنای تـۆ

❋ ❋ ❋

نەرگس و سۆسەن و وە نەوشە — مەستی بۆنی بێ هـەوای تـۆ
سـەروی جـۆباران ئـەلەرزین — لە شـەرمی شـنەی باڵای تـۆ
عـاشقانی تـۆ هـەر زیندوون — تـا ئـەبەد لە بەر وەلای تـۆ
چەن نیشانەی پێ نیشان داین — هـاتنی دەوری دنـیای تـۆ
سـوپای ئـەبرەهەی خـەتابار — بوون بە سەر گەردی ئاڵای تۆ
چواردە تاقی قـەسری کیسرا — کەوت لە بەر بەرقی باڵای تـۆ
ئـاگـری فـارس کـوژاوە — بە سەیلی وەشتی صـەفای تـۆ
ئاوی ساوە بە عەرزا ڕۆ چوو — یـانێ ڕۆ ئـەچن ئـەعدای تـۆ
بت لە بـەیتا سـەرنگوون بوو — بە هـەوای بـای ئـیهتیدای تـۆ

❋ ❋ ❋

صـاحیبا سـەیدا مـەولانا — بۆ هـەموو عـالەم مـەولای تـۆ

ئـــەم جـــیهانە چـای ظـوڵماتە — گـەر نـەبێ نـووری چـرای تـۆ
ڕۆژی تـــاڵی قـــەهری بـــاری — دێـــنە لای تـــۆ مـــاسیوای تـۆ
دێتە سوجدەی عەرزی تـەعظیم — بـــۆ تکـای ئـەهلی پـەنای تـۆ
چاو هەڵێنە بە لوطف و ئیحسان — بـــۆ بـــریندارى ســـەودای تـۆ
بـەڵکو ڕزگـار بـین لە مـەینەت — بە فەیضی نـووری سـیمای تـۆ

❊ ❊ ❊

ڕەبـــــبی بـــینێرە صـــەلاوات — بۆ حەبیبی خۆش لیـقای تـۆ
ئـەحمەد و ئـەسعەد و مـحمد — موجتەبایە و مـوصطەفای تـۆ
هـــەم لە بـــۆ ئـال و یـاران و — ڕێ ڕەوی ڕێی ئیهتیدای تـۆ
تا نەسیمی سەحەر لە کـۆسار — بێتە سەر سـەبزەی چـیای تـۆ
تـا دڵـی پـاکـی یـاری دڵـدار — (نامی)یە بە صەفای هەوای تۆ

ئامینە ئەفەرموێت چەند مانگێک لە پێش پەیدابـوونی حـەزرەتداﷺ بـاوکی ڕۆیشتبوو بۆ سەفەری بازرگانی بۆ شام وە لە ڕێگەدا وەفـاتی کـرد، وە ئـێمە لە چاودێری‌ی (عبدالمطلب)ی با پیریدا بـووین، ئـەویش لە شـەوی پـەیدابـوونی حەزرەتدا لەگەڵ دەستەی دۆست و ئەولاد و خـزمانیا ڕۆیشـتبوو بـۆ حـەرەمی (بیت‌الله) بۆ ئەوەی هەندێ شوێنی ڕووخابوو، چاکی بکاتەوە، منیش لەو کـاتەدا لەبەر بێ کەسی‌ی خۆم دڵم پەرێشان بوو، بەلاّم بە لوطفی خودای تەعالا لەو کاتی عاجزی‌یەدا وەزعێکی خۆش وشادی‌یەکی زۆرم کەوتە دڵەوە، وە دنیام لە پـێش چاودا دەر کەوت، حەتا وەکو قەصر و خانوەکانی شاری بوصرام ئەدی لە ولاتی شام، وە چاوم کەوت بە سێ ئالایی یەکێکیان لە خۆر هەلاّتی مەککە، وە یەکێکیان لە خۆر نشینی مەککە، ئەویشیان لە سەربانی (کعبة‌الله) هـەڵ کـرابـوون. یـەعنی حەزرەتی پێغەمبەری ڕەهبەر لە شاری مەککەدا پەیدا ئەبێ، وە ئالاّی دینی ئیسلام بەرز ئەکاتەوە لە شاری مەککە، بەلاّم بە هیزی دینەکەی خۆر هەلاّت و خۆرنشینی عالەم ڕوشن ئەکاتەوە.

وە ئەی فەرموو تیپ تیپ فریشتەم ئەکەوتە پێش چاو کە لە ئاسمانەوە ئەهاتنە خوار بۆ زەوی وە دەورو بەری ماڵی کەعبەیان داگرتبوو. یەعنی فریشتەی ئاسمان بە فەرمانی خودای میهرەبان حازر بوون بۆ پێشوازی کردن لە حەزرەتی (محمدالمصطفی)ﷺ وە ئەی فەرموو هەر لەو کاتانەدا نوورێکی زۆر کەوتە دڵمەوە و پێغەمبەری نازداری شیرین کردەوە و رەفتار بە قودوومی پیروزی خۆی ڕووی دنیای موبارەک کرد(عَلَيْهِ آلفُ صَلاٰةٍ وَ تَحْيَةٍ وَ سَلاٰمٍ).

* * *

بە لوطفی خودا لێ بوومەوە لە نووسینی ئەم کتێبە بچکولە لە شەوی دووشەممەی یەکەمی مانگی (ذی القعدە)ی ساڵی ١٣٨٠ی هیجری، ڕێکەوتی ساڵی ١٩٦١ی میلادی لە مزگەوتی حەزرەتی عبدالقادری گەیلانی(قدس سرە) لە شاری بەغدا.

# مەولودنامەی نەو ئەسەر

یا

# تاریخی پێغەمبەر

بە قەلەمی

# شێخ محمدی خاڵ

ئەندامی مەجمەعی عیلمی

## بە ناوی خودا

## سەرەتای چاپی یەکەم

پێویستە لە سەر هەموو کەسێک زانینی سەرگوزەشتی پیاوانی گەورە و هەڵکەوتووی جیهان، تا بکرێن بە سەرمەشقی ژیان، لە هەموو گوفتار و کردارێکیانا.

هەر لە بەر ئەمەیە کە خواش لە قورئانا لە زۆر جێ داستان و سەرگوروشتەی پێغەمبەران ئەگێرڕێتەوە بۆ پێغەمبەری ئیسلام، کە گەورەترین هەڵکەوتویە کە، لە هەڵکەوتووانی جیهان، وە یەکەمین کەسێکە کە دەرگای پێشکەوتن و خۆشبەختی کردوەتەوە لە کۆمەڵی ئادەمی وە رزگاری کردوون لە نادانی و بتپەرستی و شتی پڕ و پووچ، وە چرای زانین و کرد و کۆشی هەڵگیرساند لە رۆژ هەلاَت و رۆژ ئاوا، وە ژیریی و بیری رزگار کرد لە زیندانی چاولێ کەریی و دیلیی.

ئەمە هەزار و سێسەد و حەفتا و یەک ساڵە ئەم کارخانە و دام و دەزگایە دامەزراوە، شەوو رۆژێ حەوت سەد ملیۆن مەردوم پێنج جار لە نوێژا ئەم پێغەمبەرە بەگەورە ناو ئەبەن، وە گەواهیی لە سەر پێغەمبەریەتی ئەدەن، بەیانیان کە شەبەق ئەدا بە ملیون بانگدەر لە هەموو لایەکەوە بانگ ئەدەن، وە بە ملیونەها مەردوم بە دەنگیانەوە ئەچن، زۆر لە پەردەی شەرم و شکۆها نوێژ ئەکەن، وە ناوی خوا و پێغەمبەر ئەبەن، هەر بەو رەنگە نوێژی نیوەرۆ و ئێوارێ و شێوان و خەوتنان، هەروا بووە و هەروا ئەبێ تا جیهان جیهان بێ.

زانینی سەرگوروشتی وداستانی ژیانی ئەم پێغەمبەرە گەورەیە بۆ هەموو کەسێک پێویستە، چ جای مسڵمانان، کەچی لە هەموو کەس بێ ئاگاتر لە بەسەرهاتی ئەم پێغەمبەرە ئەوانن.

بێگانە و ئەرووپایی‌یەکان هەموو داستانی پێغەمبەریان لە بەرە، وە ئەزانن چۆن

هاتۆنە جیهانەوە، وە چۆن بناغەی ئەم دینەی دامەزراندووە، کە چی ئێمە هیچ.

بۆ ئەوەی کە هاو زمانەکانم لە داستان و سەرگوزەشتەی پێغەمبەرەکەیان بگەن، هاتم بە ناوی مەولوودنامەوە لە بەسەرهاتی پێغەمبەر ئەم چەند لاپەڕەیەم نووسی بەڵکو خوا یاریێ بەم بەهانەیە بخوێنرێتەوە لە ناو مەردوما، وە گوێی لێ بگرن، وە لە ژیانی پێغەمبەرەکەیان کەمێ شارەزا ببن.

بە پشتیوانی خوای یاریدە دەر

ئەم ئارەزووەم بۆ ئەچێتە سەر

بلبلی هەمیشە خوانی کوردستان، وەنەواکاری (ژیان) پییرە مێردی خۆمان، لە سەر چڵی دار گوڵی داستانی راستانی پێغەمبەرەکەمان، بۆمان بوو بە نەغمە خوان سروودی، دروودی مەولودنامە، کە لە میانەی گوزارشاتی پێغەمبەرییدا بە گۆرانیی ئەخوێنرێتەوە هی ئەوە، لە خوام ئەوێ پاداشی ئەم خزمەتەی، پێغەمبەری راهبەر، تکاکاری بێ.

محمدی خاڵ

## سەرەتای چاپی دووهەم

لە ساڵی ١٣٥٨ ک = ١٩٣٦ ز، کە خوا لێخۆشبوو پیرەمێرد سەرۆکی زانستی بوو، ویستی مەولوودێک بخوێنێتەوە لە زانستی، لەو حەلەشا لە مەولوودنامەکەی شیخ حسەینی قازیی زیاتر ـ کە سەد و پەنجا ساڵ بوو نوسرابوو ـ هیچی‌تر نەبوو، کە ئەویش زۆری قسەی پررو پووچن، وە شعرکانیشی عەرەبیین، ناچار پیرەمێرد داوای لێ کردم کە مەولوودنامە یەک بنووسم منیش هاتم لە مێژووی پێغەمبەر کورتەیەکم دەرهێنا، لەو باسانەی کە ببن بە سەرمەشق بۆ هەموو کەسێک، وە بۆ هەموو گەلێک.

لە پاشا هەرباسێک کەمن ئەم نووسی، پیرەمێرد ئەیکرد بە شیعر، تا لە میانەی مەولوودنامەکەدا بخوێنرێتەوە بە نقام و دەنگی خۆشەوە، رۆژێ لە پێش مەولوودا پیرەمێرد دۆستان و ناسیاوانی بانگ کرد بۆ گوێ گرتن لە مەلوودنامەی تازە، وە ئەم شعرانەی دواوەی بە چاپکراویی بۆ ناردن:

زانستی چرای خوێندنی هەڵکرد دوژمنێکی وەک نادانیی کز کرد
ئێستاش ئەیەوێ بۆ پاسی ئایین گیانی پێغەمبەر بکا بە پەرژیین
وا مەولوودێکی تازە ئەخوێنیین بۆ عەسری هەینی زوو تەشریف بێنین

ئەم مەولوودنامەیە لە ساڵی ١٣٥٩ ک = ١٩٣٧ ز لە چاپ درا، لە ماوەیەکی زۆر کەما بڵاو بووەوە، لەوحەلەوە داوای چاپ کردنەوەیم لێ ئەکەن، دوای لێ زیاد کردن و قەڵەم تێ بردن و پوختە کردنێکی باش، وا لە چاپماندایەوە.

هیوادارم بە تێگەیشتن و پێگەیشتنی گەلی کورد کە لە جاری پێشوو زیاتر پەسەندی بکەن، ئیتر لە سەر خوا.

محمدی خاڵ

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەی مسڵمانینه! هەموو گەلێک، ساڵانه چەند کۆبوونەوەیەکی دینی هەیه، وه ئەم جۆره کۆبوونەوەیه، کردەوەیەکی زۆر جوان و پەسەندە له مێژووی گەلانا، وه قازانجێکی ئێجگار زۆری هەیه بۆیان، چونکه ئەگەر به هۆی دوورکەوتنەوەیان له سەر چاوەی دینەکەیان، سستییەک رووی تێ کردبن، بەو کۆبوونەوەیه گەرم و گورر ئەبنەوه، وه ئەگەر نەخوش کەوتبن. چاک ئەبنەوه، وه ئەگەر مردبن زیندوو ئەبنەوه.

هەموو ساڵێک له رۆژی (١٢)ی مانگی مەولودا به هەزاران کۆڕی مەولودی تیا ئەگیری، شاعران شیعری رەنگاو ڕەنگی تیا ئەڵێن، خوێندەوارانی بەرز ووتاری جوانی تیا ئەنووسن، ڕۆژنامه و گۆڤارەکان ستوون و لاپەڕەی خۆیانی پێ ئەڕازێننەوه، هەر وەک به هەزاران ووتاری بەرز و جوانیشی تیا ئەخوێنرێتەوه، له سەر ئێزگەکان، وه ئەوانیش ئەم دەنگ و باسه خوشه له رۆژهەڵاتەوه بۆ رۆژ ئاوا له رۆژ ئاواوه بۆ رۆژ هەڵاتی به دیاریی ئەنێرن.

لەم رۆژەدا پێویسته به ئێمەش یادێکی پێغەمبەرەکەمان بکەین، وه له سەردەستی ئەوا بیير و برروامان تازه و پەیمانمان دەمه زەرد بکەینەوه.

❋ ❋ ❋

کاتێ که خوا ویستی دەرگای خۆشی و خۆشبەختی بکاتەوه له کۆمەڵی ئادەمیی، وەرزگاریان بکات له بتپەرستی و، نادانی و، رەووشت و خووی خراپ و، شتی پرر و پووچ، خستییه دڵی عبداللهی باوکی پێغەمبەرەوه، بۆ خوازبێنی کردنی ئامینەی کچی (وەهەب) گەوهەری جەستەی پێغەمبەر له منالدانی ئامینەدا جێ گیير بو، دوای دوومانگ، باوکی پێغەمبەر چو بۆ شام، لەو سەرەوه که گەڕایەوه، له شاری مدینه، نەخۆش کەوت و مرد، له هەموو ماڵی دنیادا، پێنج ووشتر و، چوار

مەڕو، کەنیزەکێکی، لە پاش بەجێ ما، کە ناوی (بەرەکە) بوو.

کاتێ کە ئامینە سکی بوو بە نۆمانگە، بەیانی ڕۆژی دووشەممە دوانزەهەمی مانگی ربیع الاول، بەرێکەوتی (٢٠) نیسان، لە ساڵی ٥٧١ م.

پێغەمبەر کە محمدی، کورری عبداللهی، کورری عبدالمطلبی، کورری هاشمی، قورەیشی یە، لە دایک بوو، لە شاری مەککە، لە ماڵی ئەبوتالبی مامی، لە مزگێنی ئەم مژدە خۆشەدا، ئەبولەهەبی مامی کنیزکێکی بو ناوی (سووەیبە) بوو، ئازادی کرد، عبدالمطلبی با پیریشی، بە مەلوتکەیی بردی بۆ کەعبە، تەوافێکی پێ کرد، ڕۆژی حەوتەشی، میوانداری یەکی باشی کرد بۆ هەموو گەورەکانی قریش و، ناوی نا محمد، ئامینەی دایکی ووتی: لە خەوا پێیان ووتووم کە ناوی بنێم ئەحمد، با پیری فەرمووی ناوی ئەحمدیشە و محمدیشە.

قوربانی ناووت، ناووت چەن خۆشە ئارەقت گولاو، بۆنت وەنەوشە
ناووت بووەتە، بەستەی فریشتە کلیلی دەرگای، باغی بەهەشتە
لە ژێر بارەگای خوادا نوسراوە فرستادەییت پێ سپێرراوە
بە ناوی تۆوە، چرا هەڵکرا لە دور و نزیک، ڕێی پێ دەرکرا
خوا ناوی کردەوی بە هاوناوی خۆی مایەی بلندیی، ناوی خودا تۆی

❋ ❋ ❋

چەند ڕۆژێ سووەیبە شیری دایە، لە پاشا دایان بە دایەن، بە حەلیمە ناو، کە ژنە لادێ یی یەک بووە، لە هۆزی (بنی سعد)، لەگەڵ خۆی بردی بۆلادێ، دوای پێنج ساڵ بە ساغی هێنایەوە بۆ ئامینەی دایکی.

لە تەمەنی شەش ساڵیدا، دایکی بردی بۆ مدینە، بۆ دیدەنی خاڵوانی باوکی، مانگێک لەوێ مانەوە، منالانی مەدینە، ئەومانگە زۆریان یاری لەگەڵ پێغەمبەرا کرد، وە هۆگری خۆیی و ڕەووشت و خووی بەرزی بوون، وەک خوا ویستبێتی، مەدینەییەکان، هەر لە منداڵی یەوە، ڕامی پێغەمبەر بکات، وابووە، تا لە پاشە ڕۆژا یارمەتی بدەن، وەخۆیان بکەن بە باڵا گەردانی.

لەو سەرەوە کەگرانەوە، دایکی لەرێ نەخۆش کەوت و مرد (بەرەکە) لەگەڵ خۆی هێنایەوە بۆ مەککە، عبدالمطلبی با پیری بردی‌یە لای خۆی و بە خێوی کرد، تا تەمەنی هەشت ساڵی، لە پاشا با پیریشی مرد، ئنجا ئەبوتالبی مامی بردیە لای خۆی و کردی بە شووان، ئەمەش لە خواوە بووە، بۆ ئەوەی کەفێری شوانیی بکات، تا لە پاشە رۆژا بیکات بە شوانی هەموو ئادەمی.

لە تەمەنی دوانزە ساڵیدا، لەگەڵ ئەبوتالبی ماموی چوو بۆ شام، لە وێ (بوحەیرا)ی قەشە زۆری لێ وورد ئەبێتەوە، وە بە منالێکی زۆر هەڵکەوتووی دێتە پێش چاو، وە چەن پرسیارێکی لێ ئەکات، پێغەمبەر وەرامی ئەداتەوە، لە پاشا لەمامی ئەپرسێ ئەمە کوڕری کێ‌یە؟ ئەڵێ کوڕری خۆمە، ئەڵێ نابێ کوڕری تۆبێ، ئنجا ئەڵێ برازامە و باوکی مردووە، ئەڵێ راست ئەکەیت، ئاگاداریی بکە، ئەمە پاشە رۆژێکی زۆر بەرزو گەورەی ئەبێ.

هەر شادبێ خودایا بە درووددێکی دەما دەم
ئەو رۆحە کە فەرمووتە ئەوە رەهبەری ئادەم
ئەو رۆژە کە هێناتە جیهان، هەرچی کە ئەیدی
ئەی ووت: ئەمە عیسا خبری‌دا کە یەتە دی
بۆیە کە (بحیرا)ش ئەوی دی ناسیەوە زوو
ئەو بەهرەیە دابوتێ، بە منداڵی دیار بوو
مژدەت بە کەسێ دابێ بە فەرموودەی (لولاک)
پەروەردەی تۆ، چۆن سەری بۆ ناخەنە سەر خاک
ئەو خلقە پەسندە، بە بژاردە کە بەووت دا
(لامارتینی) مشهوری فەررەنگ بۆی بووە شەیدا
ئەم کۆنە جهانەت بەوەوە خستەوە رەونەق
بۆ کۆمەڵی و کومەکی یەک کردتە سەردەق

لە تەمەنی (٢٥) ساڵیدا بە تجارەتی (خدیجە)ی کچی (خووەیلد) چوو بۆ

(بصرا) ـ کە ناوی شارێکە لە وولاّتی شام ـ حەلێ کە گەشتنە ئەوێ، لە تـەنشت کڵیسەیەکەوە، وە لە ژێر دارێکا خەستیان، گـەورەی ئـەو کـڵیسەیە ـ کـە نـاوی (نسطورا)، وە قەشەی هەرە گەورەی گاورەکان بوو ـ چوو بۆ لای پێغەمبەر، وە زۆر لێیّ وورد بووەوە، وە لە ناو چاوانیا گەلێ شتی خوێندەوە، وە بە پیاوەکەی ووت ـ کە ناوی (میسرە) بو ـ ئاگاداریی ئەم کوررە بکە، ئەمە ئەبێ بە پیاوێکی زۆر گەورە.

لە تەمەنی (٣٥) ساڵیدا لافاو کەعبەی رووخاند، هەموو تییرەکـانی قـورەیش دەستیان کرد بە دروست کردنەوەی، کاتێ گەیشتنە دانانی (حجرالاسود) بوو بە دەم قاڵی، هەر تییرەیەکیان ئەویست ئەوان ئەو بەردە دابنێن، وە ئەو شانازیی‌یە بەوان ببڕێ، وای لێ هات کە خوێنی تیا بڕژێ تا یەکێکیان ووتی ئەم هەرایەی پێ ناوێ، ئەمرۆ کێ یەکەم جار لە (باب الصفا) وە هاتە حەوشی کەعبە، ئەوکەسە حەکەم و دەم راستمان بێ، وە هەرچێکی ووت لە قسەی دەر نەچین، بەرێکەوت ئەو رۆژە یەکەمین کەس کە چووە حەوشی کەعبە لەو دەرگایەوە پێغەمبەربوو، هـەموو بـە جارێ ووتیان: وا (محمد أمین) هات، وە هـەموو بـە فـەرمانی ئـەو رازیـین، وە قسەکەیان بۆ گێـرایەوە، ئەویش فەرمووی عەبایەک راخەن و (حجرالاسود)ی لە سەردانێن، لە پاشا بە گەورەکانی قریشی ووت: کە هەریەکە سووچێکی عەباکـە بگرن و بەرزی بکەنەوە، کە گەیشتە عاستی خۆی، پێغەمبەر لە سەر دیوارەکـەوە بەردەکەی لێ وەرگرتن، وە لە جێـی خۆی داینا، بەم رەنگە ئەو ئاژاوە گەورەیەی کووژاندەوە، وە ئەو بەهرە گەورەیەش بوو بە بەشی ئەو.

ئەم پێغەمبەرە نازدارە، نە باوک و دایکی خۆی دیـوە، نـە لە لەیـەکـی بـووە ئامۆژگاریی بکات، نە مامۆستایەکی بووە رەووشت و خووی فێر کات، بە هەژاریی و نەخوێـندەواریی گەورە بووە، لە ناو گەلێکی نادانی بت‌پەرستی، بێ ویـڵی، بـێ رەووشت و خووی، خاوەن پرر و پووچا،بە پێی دەستوور و باوی خوا لە جیهانا، ئەبوایە لە سەر رەفتارو رەووشتی ئەوان گەورە بـبوایـە، وە هـەرزەیی و خـووی ئەوانی بگرتایە، کە چی بە پێـچەوانەی ئەوە، رۆژ بە رۆژ لە ژیریی و، بیرو، تـێ

گەیشتن و، پێگەیشتن و، هونەرمەندیدا، سەر ئەکەوت و پێش ئەکەوت، وە ئارەزووی دنیای کەم ئەبوو، وە ئارەزووی تەنیایی و خوا پەرستی زۆر ئەبو، هەموو ساڵێک مانگی رەمەزان ئەچووە ئەشکەوتی (حراء) بە تەنیا خەریکی خواپەرستی ئەبوو، وە بیری ئەکردەوە لە ئاسمان و، زەوییی و، رۆژ و، مانگ و، ئەستێرە، وە بارەها لە دڵی خۆیا ئەی ووت، ئاخۆ کێ ئەمانەی دروست کردبێ؟ ئەم بتە تاشراوە بێ گیانانە ئەبێ چ کەڵکێکیان بێ؟ ئەم ئینسانانە لە کوێ وە هاتوون و بۆ کوێ ئەچن؟ ئەم هەموو زۆر و ستەمەی کە لە یەکتری ئەکەن هەروا ئەرِرواو وون ئەبێ، یا لێ پرسینەوەیەک هەیە؟ کێ ئەپرسێتەوە؟ کەی ئەم پرسیارە ئەکرێ؟ وە لە کوێ ئەبێ؟ ئاخۆ چ رێگایەک کۆمەڵی ئادەمیی بگەیەنێ بە یەکێتی و برایەتی ودۆستی، وە دوژمنایەتی و، بتپەرستی و، بەدکرداریی و، پیاو کوشتن و، خوێن رشتن، لە ناوا هەلگرێ، بەم رەنگە هەمییشە لە سەرگەردانی دا بوو، تا خوا بە چرای پێغەمبەریەتی لە تەمەنی چل ساڵیدا دڵی پییرۆزی رووناک کردەوە، وە کردی بە ئەلکتریکێکی وا کە تاریکی جیهانی پێ لاچوو.

خودایا زۆر ستایش بۆ سروشتی پاکی پێغەمبەر
کە بۆ پایندەی ئەم ئایینە، ئەحکامی ئەوە رەهبەر
بە گەنجی پێشەوای قەومێکی زۆر مشهور و ناودار بوو
بە بێ خوێندن ئەوی فەرمووی، نموونەی بەرزی گوفتار بوو
ئەوی ئەیدی، بە دڵ ئەیووت: ئەمە جێی باوەڕە راستە
امامی شافعی فەرموویە: وا خلقاوە خۆ خواستە
بە دەستی ئەونرایە قوڵفی کەعبە، بەردکەی جەننەت
بوە پایەی بڵند بوو، وک موفرِک ماچی ئەکەن، ئوممەت
بە دەستووری حەکیمی هەرچی فەرمویە، دەوای دەردە
لە ئەو روپاش ئەڵێن (طب النبی) باوە سەراووردە

ئەگەر ئەو خوی بەدەی کچ کوشتنەت تـۆ هـەڵ نـەگـرتایە
دەبـــوو ئـــافرەت نـــەمایە، بـۆ رسـالەت تـۆش نـەبویتایە

* * *

پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) ئەفەرموێ بە تەنیا لە ئەشکەوتی (حرا) پـاڵ کەوتبووم، بە دڵ بێدار، بە چاو نوستبووم، روانیم فـریشتە یـەک هـاتە بـەردەمم لەوێنەی ئادەمی‌یەکا، پێ ووتـم (اقـرأ) واتـە بـخوێنە ئـەفەرموێ مـنیش ووتـم: خوێندەوار نیم، ئەڵێ باوەشی پیا کردم و بە توندیی نوساندمی بە سنگی‌یەوە، تـا هێزی لێ برریم، ئنجا بریدام و دوو بارە پێ ووتم (اقرأ) ئەفەرموێ وەتم: خوێندوار نییم، دووبارە گوشیمی بە سنگی‌یەوە، تا پشووی لێ برریم، ئنجا بەریدارم و سێ بارە پێی ووتم (اقرأ) پێغەمبەر ئەفەرموێ لە ترسی ئەوەی نەوەک جارێکی‌تر مەڵم گوشێتەوە، ووتم چی بخوێنم؟ ووتی (إِقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذي خَلَقَ، خَلَقَ الْإِنْسانَ مِنْ عَلَق، إِقْرَأْ وَ رَبُّكَ الْأَكْرَم. الَّذي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ. عَلَّمَ الْإِنْسانَ ما لَمْ يَعْلَمْ) واتە بخوێنە بە ناوی خوایەک ئەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە، وە ئادەمیی لە خوێن پارە پەیدا کردووە، خوای تۆ گەورەیەکی میهرەبانی وایە، کە ئادەمیی کردووە بە زانا بە هۆی قەڵەمەوە وە ئادەمیی زانا کردووە بەو شتانەی کە نەی ئەزانی.

پێغەمبەر ئەفەرموێ: بە دەم ترس و لەرزەوە بێدار بـوومەوە، بـەلاّم کـە وورد بوومەوە لە خۆم، بینیم کتێبێک لە سنگما نوسراوە و نەقشی بەستوە.

پێغەمبەر ئەفەرموێ لە ترسانا لە ئەشکەوتەکە هاتمە دەرێ و ڕوم کردە چۆڵ، بییرم ئەکردەوە لە خەوەکەم، ناگاە یەکێک بانگی کردم، کە سەرم بەرز کردەوە بینیم فریشتەکە وا بە ژوور سەرمەوە وێستاوە، ووتی تۆ پێـغەمبەری خوایت بـۆ سـەر ئادەمیی.

پێغەمبەر ئەفەرموێ سامێکی زۆرم لێ نیشت و رووم لێ وەرگێڕا. بەلاّم رووم ئەکردە هەر لایەک، لە بەر چاووم بوو.

پێغەمبەر ئەفەرموێ بەدەم لەرزەوە چوومەوە بۆ ماڵەوە، دایان پۆشیم لە پاشا کە

بێدار بووەوە چی دی بوو گێڕایەوە بۆ خدیجە خاتوونی خێزانـی، وە پـێی ووت ئەترسم کە دەستم لێ وەشێنرابێ، ئەویش ئەڵێ: خوا چۆن تۆ شێت ئەکـات بـەم هەموو رەوشت و خووە برزەوە، وە بەم هەموو کردەوە جوانانەوە.

لە پاشا تا ماوەی چل رۆژێ، سروشی بۆ نایەت تا رۆژێک لە ناکاو دەنگێک لە ئاسمانەوە ئەبیسێت، کە سەر بەرز ئەکاتەوە ئەو فریشتەیە ئەبینێ کە لە ئەشکەوتی حراء هاتە لای، دووبارە ڕووی لێ وەر ئەگێڕێ و بە ترسەوە ئەچیتەوە مـاڵەوە ئەفەرموێ: دام پۆشن، لەو دەمەدا ئەم ئایەتەی بە سرووش «وحـی» بـۆ دێ کـە ئەفەرموێ [یَا أَیُّهَا الْمُدَّثِّرْ، قُمْ فَأَنْذِرْ، وَ رَبَّکَ فَکَبِّرْ، وَ ثِیَابَکَ فَطَهِّرْ، وَ الرُّجْزَ فَاهْجُرْ، وَ لاتَمْنُنْ تَسْتَکْثِرْ، وَ لِرَبِّکَ فَاصْبِرْ) و اتە ئـەی ئـەوکەسەی کـە لە ترسا خـۆت داپۆشیوە، هەستە مەردوم بترسێنە بە خواو رۆژی دوایی، خوای خۆت بەگـەورە بگرە، بەرگ و کالاّت پاک رابگرە، بت ژێر پێ بخە، شت مەدە بە مەردوم و چاوت لە پاداشی زیاتربێ، وە لە ڕێی خودادا خۆت رابگرە.

خدیجە خـاتوون ئـەفەرموێ: کـە چـوومە ژوورەوە لای پـێغەمبەر بـینیم وا خەبەری بۆ تەوەو ببیر ئەکاتەوە، منیش پێم ووت: بو نانوویت؟ ئەویش فەرمووی، نوستن رۆی، چونکە جبرئیل فەرمانی پێ دام لە خواوە کە بانگی مەردوم بکەم بۆ خوا پەرستی و برروا هێنان، ئنجا نازانم بە کێ بڵێم؟ وەکێ بە قسەم ئەکات!

پێغەمبەر ئنجا بەرە بەرە دەستی کر بە گەیاندنی فەرمانی خوا بە مەردوم، یەکەم کەس کە بروای پێ هێنا لە ژنانا (خدیجە) خاتوونی خێزانی، لە پیاوانا (أبوبکری صدیق) لە ئازاد کراوانا (زید)ی کوری (حارثە) لە بەندەگـانا (بـلالی حـبشی) لە منالاّنا (حەزرەتی علی) بوو، لە پاشا عثمان و سعد و طلحە و زبیر و عبدالرحمان و گەلێکی تر مسڵمان بوون.

پێغەمبەر بە تایبەتی، لە کاتی حەج و، تەواف و، کوبوونەوەیانا، ئەچوە ناویانەوە، باسی خوای بۆ ئەکردن، وە لە بێ کەڵکی بتەکانیان ئەدوا، لەم حەلەدا (حـمزە)ی مامی مسڵمان بوو، گەورەکانی قریش زانیان ئەگەر ئەم کارە بۆ پـێغەمبەر بـچێتە

سەر، ئەوان گەورەیی‌یان نامێنێ، هاتن دەستیان کرد بە ئازارا دانی خۆی و هاورێکانی.

لە ساڵی پێنجەمدا پێغەمبەر هێندێ لە هاورێکانی نارد بۆ وولاتی حەبەشە، هەرچەند بە دیمەن بە ناوی کۆچەوە بوو، بەڵام لە دلاّ بۆ بلاّو کردنەوەی ئایینی ئیسلام بوو، گەورەکانی قورەیش کە تێگەیشتن، دووکەسیان نارد بۆ لای (نەجاشی) پاشای حەبەشە، بە دیاری‌یەکی زۆرەوە، تابیان هێننەوە، نەجاشی ووتی تا چاوم پێ‌یان نەکەوێ نایاندەمەوە، لە پاشا ناردی بە شوێنیانا، وە لێی پرسین بۆچی لە ئایینی خۆتان لاتانداوە؟ وە ئەم ئایینە تازەیە چی‌یە کە چوونەتە سەری؟ لە مسڵمانەکان جەعفەری کورری (أبو تالب) ووتی: ئەی پادشا ئێمە گەلێکی نەزانی بت‌پەرستی، داوێن پیسی، پیاو کوژی، دراوسێ وەزەن بووین، قسەمان لەگەڵ یەک نەئەکرد، کچمان زیندە بە چاڵ ئەکرد، گۆشتی مردارەوە بوومان ئەخوارد زۆر دارمان زەبوونی قووت ئەدا، تا خوا پێغەمبەرێکی پاکی، راستی، خانەدانی، بۆ ناردین، گێررای نی‌یەوە، لەو کارە خراپانە، وە هینای‌نی‌یە سەر خوا پەرستی و ناسینی بەتاک و تەنیا، وە بە راستی و بێ زیانی و، چاوپۆشی و دادپرستی و یارمەتی و، دەست گرتنی یەکتریی، وە بە نوێژ و، رۆژوو، وە بە دەست کێشانەوە لە سەرو، ماڵ و، ناموسی مەردوم ئێمەش باوەررمان پێ کرد و، برروامان پێ هێنا، گەلەکەمان کە ئەمەیان زانی، هاتن بە سەر مانا، زۆر و ستەمێکی گەورەیان لێ کردین، وە ئازار و سزایەکی زۆریان داین، تا پەشیمانمان بکەنەوە، ئێمەش رووماان کردە وولاّتەکەی تۆ، وە پەنامان هێنا بۆتۆ، هیوادارین کە لە سێبەری تۆدا زۆر و ستەممان لێ نەکرێ.

نەجاشی ووتی لەو قورئانەی کە بۆ پێغەمەرەکەتان هاتووە، شتێکم بۆ بخوێننەوە، جەعفەری کورری ئەبو تالب لە هەوەڵی سوورەی «مەریەم»ەوە ـ کە باسی عیسا و مەریەم ئەکا ـ بۆ خوێندووەوە، تا گەیشتە ئایەتی (السَّلامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدْتُ وَ يَوْمَ أَمُوتُ وَ يَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا) کە نەجاشی و قەشەکانی ئەم فەرمایشەیان

بیست کە لەگەڵ ئینجیلا یەک ئەگرێتەوە ـ ووتیان بە خـوا ئـەم فـەرموودەی لە سەرچاوەیەکەوە هاتووە، کە ئینجیلی عیسای لێوە هاتووە، ئـنجا نـەجاشی پـیی ووتن: برۆن سەربەست بن: من ئێوە نادەمەوە بەوان.

بەراستی هێندێ لە حەبەشی‌یەکان مسڵمان بوون، لە مکەش عومەری کووری خەتاب مسڵمان بوو ئیتر مسڵمانەکان نختێ بە هێز بوون، بە سەربەستی ئەچوونە حەوشی کەعبە خواپەرستی‌یان ئەکرد، گەورەکانی قورەیش زۆریان پێ ناخۆش بوو، هەرچێکیان لە دەست بهاتایە دەربارەی پێغەمبەر و یـارانـی، درێـغی‌یان نـە ئەکرد، ئنجا پێـغەمبەر بە تەنها چو بۆ (تائف) بۆ بلاّو کردنەوەی ئـایینی ئـیسلام، هەرچەندە بە سەر دانیشتووانی ئەوێدا هات، مسڵمان نەبوون، بـەڵکو زۆریشـیان بەردە باران کرد، ناچار هاتەوە بۆ مەککە، لەوێ کۆمەڵێکی پەنهانی رێک خست، لە چل کەس، لە یارانی، خانەدانی، گەنجی نەوجوانی، خوێن گەرمی، دەمار گرژ، بە سەر کردەیی‌و، سەرپەرشتی خۆی، هەر رۆژە نەرۆژێ، بەدزی‌یەوە، کۆ ئەبوونەوە لە ماڵی (أرقم) ـ کە ناوی یەکێک بووە لە یارانی، وە خانوەکەی لە کەناری شاری مەککە بووە ـ لە بابەت کار دروستی مسلمانان و بلاّو کردنەوەی ئایینی ئیسلام و لابردنی پررو پووچ و، نادانی و، زۆر و، ستەمی بێ باوەررەکانەوە ئەدوان هەریەک لەم کۆمەڵە، بە شەو بە رۆژ، خەریکی بلاّو کردنەوەی خواستی کۆمەڵەکەی بوو، وە هەموو جۆرە ئازار و، سزاو، ناخۆشی‌یەکیان ئەچەشت لەو رێگایەدا تا بە بەری کردەوە و تەقەلای خۆیان گەیشتن وە رووناکی ئیسلامیان بـلاّو کـردەوە لە رۆژ هەلاّت و رۆژ ئاوا، و پایتەختی (قەیسەر) و (کسرا)یان گرت

ئەی یەگانە گـەوهەری دەسـتی خـودا
خوا جلای دنیای بـە نـوری تـۆ ئـەدا

بۆ ئەوە تۆی ناردە ئـەشکەوتی (حـرا)
ببیە گەورە و پێشەوای هـەردوو سـەرا

نور بـە تـاریـیکی شـەو ئـەدرەوشێتەوە
جان فدای هەم رێت و، هەم هام رێتەوە

عەینی ئەو نورە بە ئـەصحابی گـوزین
باز لە تـاریکی حـەبەشدا کـەوتە دیـن

نوری ئیمان؛ پەردەی جـەهلی دڕانـد
لە شکری ئیسلام، سپای کفری شکـاند

چل صحابەی لاوی سـریی جـان فـدا
دائـمـا بـۆ ئـەمری تـۆ هـەوڵیان ئـەدا

خـوا ئـەمەندە خـۆشەویستیدا بـە تـۆ
ئومەتیشت لێ دەبـووری غـەم مـەخۆ

❃ ❃ ❃

لە ساڵی دوانزدەهەمدا شەو ڕەوی پێـغەمبەر بۆ گەیشتن بە پلەی هەرە بەرزی پێشەوایی و ڕەهنمایی ئادەمیی ڕوی دا، کە ئەمەش ناوبراوە بە (معراج) وە ئەم پێنج نوێژە لە سەر خۆی و ئومتی دانرا.

لەو سەردەمەدا لە مدینەیی‌یەکان شەشیان هاتن بۆ حەج، لە مەککە بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتن و مسڵمان بوون، بەگەڕرانەوەیان ئیسلامی‌یەت کەوتە مدینەوە.

ساڵی پاشوو دوانزەی تریان هات بۆ حەج لە (عەقەبە) ـ کە ناوی جێگایەکە ـ چاویان بە پێـغەمبەر کەوت، وە پەیمانیان لەگەڵ بەست کە ئیتر هاوبەش بۆ خوا پەیدا نەکەن، دزیی و بوختان و داوێن پیسی نەکەن، کچیان زیندە بە چاڵ نەکەن، لە فەرمانی پێغەمبەر نەچنە دەرەوە.

لە ساڵی پاشووترا، لە مسڵـمانەکانی مدینە (٧٥)یان هاتن بۆ حـەج پـێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) بە دزی قریشەوە نیوەشەو چوو بۆ لایان، دووبارە پەیمانی لێ وەرگرتن کە بە هەموو ڕەنگێک یارمەتی خۆی و هاوڕێکانی بدەن، وە بە سەر و ماڵ لە سەری بکەنەوە.

بەیانی قورەیشی‌یەکان کە ئەم پەیمانەیان بیست، لە خەفەتا وەختە بو بمرن، بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو، ئنجا پێغەمبەر یەکەیەکە هاورێکانی خۆی بە دزی‌یەوە نارد بۆ مدینە، قورەیشی‌یەکان زانیان کە وا مدینەیی‌یەکان زۆریان مسڵمان بوون، وە مسڵمانەکانی مەککەش چوون بۆ لایان، ووتیان ئەگەر بیەڵین پێغەمبەریش بچێتە ناویانەوە، ئێجگار بە هێز ئەبن، ئەو حەلە مەککەش ئەگرن، خۆلاسە زانیان کە ئێشەکە ئێجگار ناسکە، وە ئەگەر ئەم هەلەیان لە دەست دەرچێ، ئیتر هەموو شتێکیان لە دەست ئەچێ، لە (دارالندوە) کۆبوونەوە و برریاریان‌دا، کە پێغەمبەر بکوژن بەم ڕەنگە لە هەر تیرەیەک لە تیرەکانی قورەیش، یەکێکی ئازا شییرێکی بڕندە بگرێ بە دەستەوە، وە هەموو بە جارێک لێی دەن، تا خوێنەکەی بڵاو ببێتەوە بە ناو هەموو لایەکیانا.

ئەم قسەیە بە پێغەمبەر گەیشتەوە، بەڵام خۆی لێڵ نەکرد، وە مایەوە تا بەشی زۆری هاورێکانی نارد بۆ مەدینە، ئنجا خۆی و ئەبوبکریش هاتە سەر رۆین.

ئەو شەوەی کە پێغەمبەر ئەی‌ویست دەرچێ لە مەککە، قورەیشیەکان بە شییری رووتەوە دەوری ماڵی پێغەمبەریان گرت، بۆ ئەوەی کە نەیەڵن دەربچێ، ئەو شەوە پێغەمبەر هەر لە ئێوارێوە ئیمامی علی لە جێگاکەی خۆی نوواند، قوریشیکان هەر چەند لە درزی دەرگاوە تەماشای جێگاکەی پێغەمبەریان ئەکرد ـ کەوا یەکێکی تیا نوستووە ـ دڵنیا ئەبوون، کە پێغەمبەر لە جێگاکەی خۆیایەتی، لە نیوە شەوا پێغەمبەر «دروودی خوای لێ بێ» هاتە دەرەوە، وە ئەم ئایەتەی خوێندەوە فەرمووی: (وَ جَعَلْنَا مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدّاً وَ مِنْ خَلْفِهِمْ سَدّاً فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لاٰ يُبْصِرُونَ) واتە بەر هەڵست مان گێرا لە بەر دەمیانەوە و لە پشتیانەوە، وە پەردەمان هێنا بە سەر چاویانا بەرەنگێکی واکە نەبینن، ئنجا بێ ئەوەی کە کەس پێ بزانێ، چوو بۆ ماڵی ئەبوبکر، وە لەوێوە چوون بۆ ئەشکەوتی (ئەور) سێ شەوو سێ رۆژ لەو ئەشکەوتەدا مانەوە، ئەودەمەی چوونە ئەشکەوتەکەوە بە فەرمانی خوا، جاڵجاڵۆکە دەرگاکەی لێ تەنین، وە دوو کۆتر لە سەر کونی ئەشکەوتەکە هێلانە و

هێلکەیان کرد، بەیانی قورەیشێکان کە چوونە ماڵی پێغەمبەر، تەماشایان کـرد وا ئیمامی علی لە جێگاکەیا نوستووە، لێیان پرسی کوا محمد فـەرمووی نـازانـم، گەلێکیان دەردی سەریی‌دا، ئنجا چوون بۆ ماڵی ئەبوبکر، لە (ئـەسما)ی کـچیان پرسی کوا باوکت و محمد؟ ووتی نازانم، ئەبوجهل شەپازللەیەکی لێدا گوارەکەی لە گوێ پەرری، کە زانیان ڕۆیشتوون خـێرا بـڵاوبوونەوە بـە دوری مـەککـەدا بـۆ دۆزیـــنەوەیان قـورەیشی‌یەکـان بـەڵێنی سـەد ووشـتریان دا بـەو کـەسەی کـە بیاندۆزێتەوە، لە هەموو لایەکەوە زەلام بە شیبرەوە دەرچوون بـۆ دۆزیـنەوەیان، چەند کەسێکیان لە نزیک ئەشکەوتەکەوە تـووشی شـوانـێک بـوون، پـرسیاری پێغەمبەر و ئەبوبکریان لێ کرد ووتی ئەگونجێ لەم ئەشکەوتەدا بن، ئەوانیش خێرا چوونە سەر ئەشکەوتەکە، ئەبوبکر ئەفەرموێ گوێـم لە قسەکەیان بوو، لە ترسانا موچرکێک بە لەشما هات و خۆم نووساند بە پێغەمبەرەوە، لەو حەلەدا پێغەمبەر ئەچرپێنێ بە گوێچکەیا، ئەفەرموێ (لاٰ تَحْزَنْ اِنَّ اللّٰهَ مَعَنٰا) واتە خـەفەت مـەخۆ، خوامان لەگەڵە، بە هۆی جاڵجاڵۆکەو کۆترەکانەوە، خوا سـەری لێ تـێک دان و گەڕانەوە، ئەگینا ئەگەر سەرێکیان خوار بکردایەتەوە زۆر باش ئەیان بینیین، وەکار لە کار ئەترازا، بەڵام خوا ئاگاداریی پێغەمبەری خۆی ئەکات، وە لەکاتی تەنگانە و چەڵەمەدا ئەیپارێزێ، بۆیە پێغەمبەریش باکی نەبوو، وە لەکاتی وادا تێک نەئەچوو، ئنجا سێ شەوو سێ ڕۆژ لە ئەشکەوتەکەدا مانەوە، لە ڕۆژی سێیەمدا هاتنە دەرێ، ڕووەو مدینە لە قەراغ دەریای سوورەوە ڕۆین، بە حەوت قۆناغ گەیشتنە (قـوبا) چوار ڕۆژ لە وێ مـایەوە مـزگەوتێکی لێ دروست کـرد، ڕۆژی جـمعە، نـوێژی جمعەی بۆ کردن وە خوتبەیەکی زۆر جوانی بە پێی ئەو ڕۆژە بۆ خوێندنەوە، دوای جمعە چوون بۆ مدینە، مدینەیی‌یەکان بە مسڵمان و گاوور و جوولەکەوە هاتبون بە پیریەوە.

ئەم کۆچ کردنی پێـغەمبەرو یارانەی، لە گەورەترین سەرگوزەشت ئـەژمێررێ، چونکە نیشان ئەدات کە پێغەمبەر و یارانی، لە ڕێی خوا و بڵاو کردنەوەی ئایین و

قازانج و سوودی هەموانا، دەستیان هەڵگرت لە کەس و کار و خزم و خـوێش و ماڵ و مناڵ و دارایی و نیشتمانی خۆشەویستیان وە لە بەر ئەمە کراوە بە سەرەتای مێژووی ئیسلام.

ئەی شەهەنشاهی ئـاسمان و زەمـین ناوی تۆ لای خـوا (رسـولی ئـەمین)
رتـبەیەکـی تـرت کـه (لولاک)ە پـایەی بـەرزی داوە بـەم خـاکـه
ئەو شەوە چـویتە (مسـجد الاقـصی) شـاهدت نـصی (لیـلة الاسـری)
یـە دوو قـۆڵی (مـهاجر) و (أنـصار) شرق و غرب بوو بـە مـطلعی أنـوار
حەرەکەت بوو بە مایەی بـەرەکـەت ئەی سەری ئومەتت فدای سەرەکەت

❋ ❋ ❋

پێغەمبەر دە ساڵ لە مدینە مایەوە، ساڵی یەکەم مـزگەوت و خـانووی خـۆی دروست کرد، وە هەرچی گەورە و سەرکۆماری مدینە بوو، هەموی ئاشت کردنەوە، وە دوژمنایەتی و کینەی کۆنی لە ناوا هەڵ گرتن، لە پاشا دەستی هەریەکـێک لە مەککەییەکانی خستە ناو دەستی یەکێک لە مدینەییەکان وە پشتێنی برایەتی پـێ بەستن، وە هەرچێکیان بوو لە زیندەماڵ و مردە ماڵ، کردیان بە دووکەرتەوە، لەگەڵ مەککەییەکانا، وە پێکەوە دەستیان کرد بە کسب و کار.

لە ساڵی دووهەمدا، رۆژووی رەمەزان و، سەرفیترە و، زەکات و، بانگ دانرا، وە رووگە «قبلە» لە بیت المقدس‌ەوە بوو بە کەعبە، وە غەزای بدری گەورە رویدا، کە یەکەمین جەنگە لە ئیسلاما، هەرچەند بێ برواکان (٩٥٠) وە مسڵمانەکان (٣٠٥) کەس بوون، بەڵام بێ بڕواکان شکان و مسڵمانەکان (٧٠) کەسیان لە گەورەکانی قورەیش کوشت کە یەکێکیان ئەبوجهل بوو، وە (٧٦) یان بە دییل لێ گرتن، وە لێ چواردە مسڵمان شەهید کرا.

دییلەکانبە هۆی کردەوەی جوانی پێغەمبەر و مسڵمانەکانەوە، گەلێکیان مسڵمان بوون، ئەوانی تریش ئەوی دەوڵەمەند بوو خۆی کڕییەوە لە هەزار دینارەوە تـا چوار هەزار دینار، ئەوانەی کە هەژاریش بوون، پێغەمبەر نەخوێـندەوارەکانی بـە

خۆڕایی بەرەڵلاّ کرد، بەو مەرجەی کە جارێکی‌تر جەنگ لەگەڵ مسڵمانا نەکەن، ئەوانەی کە خوێندەواریش بوون پێی ووتن ئێوەش ئازاد ئەکەم بەو مەرجەی کە دەرس بڵێن بە منالّی مسڵمانەکان، وە یەکی دە منالّ فێری خوێندنەوە و نووسین بکەن، دییلەکان وەک مامۆستا بە سەر منالّی مسڵمانەکانەوە دانشیتن تا فێری خوێندنەوە و نووسیین‌یان کردن.

لە سالّی سێهەمدا، عەرەق و شەراب حەرام کرا، وە غەزای «ئوحود» روویدا.

لە سالّی چوارەمدا، غەزای «ذات الرقاع» کرا، وە ئایەتی تیمم و کورت کردنەوەی نوێژی چوار رکاتی بە دوو رکات لە سەفەرا هاتە خوارەوە.

لە سالّی پێنجەمدا، غەزای «خەندەق» روویدا، وە نوێژی ترس و تەنگانە دانرا.

لە سالّی شەشەمدا حەج لە سەر دەوڵەمەند پێویست کرا، وە پێغەمبەر کاغەزی نووسی بۆ نۆ پادشا کە مسڵمان بن، بۆ هرقل پاشای رووم، بۆ کسرا پاشای فرس، بۆ موقەوقس پاشای مصر، بۆ نجاشی پاشای حەبەشە بۆ پاشای یەمەن، بۆ پاشای عومان، بۆ پاشای شام، بۆ پاشای یەمامە، بۆ پاشای بحرین.

پاشای یەمەن و حەبەشە مسڵمان بوون، پاشای مصریش بەندەیەکی خۆی پێشکەش کرد.

لە سالّی حەوتەمدا، خەیبەر و دەورو بەری گیرا.

لە سالّی هەشتەمدا، مەککە گیرا، بەیانی رۆژی هەینی بیستی رەمەزان پێغەمبەر بە خۆیو دە هەزار کەسەوە، بە چوار قۆڵ، لە چوار لاوە، چوونە ناو شاری مەککە، پێغەمبەر تەوافی کەعبەی کرد، وە (١٦٠) بتی لە ژورو دەری کەعبە هێنایە دەرەوە، وە داری پیا ئەماڵین و ئەی فەرموو (جَاءَ الْحَقُّ وَ زَهَقَ الْبَاطِلُ) واتە ئایینی راست هاتو مرد ئایینی خراپ، لە پاشا بلال لە سەربانی کەعبە بانگی‌دا، ئەنجا پێغەمبەر پەند و ئامۆژگاریی‌یەکی زۆر جوانی خوێندەوە، لە پێشەوە سوپاسی خوای کرد لە سەر گرتنی شاری مەککە، کە لە هەوەڵەوە خۆیو چەند مسڵمانێکی رەش و رووت بە دزی‌یەوە، کۆچیان کرد، وە ئەمرۆ بە چ دەسەڵاتێکەوە هاتن وگرتیانە وە، لە پاشا

رووی کردە مەککەیی‌یەکان ـ کە ئەم هەموو ئازار و سزایەیان دابو وە ئەم هەموو مسڵمانانەیان کوشتبو ـ وە پێی فەرموون چیتان لێ بکەم، هەموو وتیان گەورەیەکی میهرەبانی وەک ئێوە هەر ئەبێ لێمان خۆش بین، ئەمیش فەرمووی ئەوا ئازادم کردن، ئیتر چ ئەهلی مەککە و چ ئەهلی دەرەوە پۆل پۆل ئەهاتن و مسڵمان ئەبوون.

ئەی پێغەمبەری شیرین کردەوە — کەعبەت لە ژەنگی بت پاککردەوە
خوا مژدەی دایتێ بە کەیف و مەرام — لَتَدْخُلَنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَام
[انا فتحنا] کە سورەی فتحە — سەراپا هیوای سەربەرزی و مدحە
ئەو رۆژە شێوەی بڵندیت نواند — کە مەککەت گرتو قریشت شکاند
لە مەککەدا بویت بێ باوک و بێ کەس — بۆ مەککە و کەعبە بوی بە فەریاد رەس
مەککەت لە دەستی بەد کار سەندەوە — بەوە ئایینی خۆت هەڵ سەندەوە

❋ ❋ ❋

لەساڵی نۆهەمدا غەزای «تەبووک» روویدا.

لە ساڵی دەهەمدا پێغەمبەر لەگەڵ (١٠٠) هەزار کەس لە یارانی چوو بۆ حەج، کە ئەمە دواترین حەجێکە کە کردوویەتی، وە ناوبراوە بە «حجةالوداع» رۆژی عەرەفەی جەژنی قوربان، لە کێوی «عەرەفات» پەند و ئامۆژگارییەکی زۆر بەرزی مسڵمانەکانی کرد، لە پاشا سوپاس و ستایشی خوا فەرمووی:

[ئەی مسڵمانینە! خوێنتان، ماڵتان، ناموستان، لە یەکتری حەرامە تا رۆژی دوایی، رۆژی خۆی بە خزمەت خوا ئەگەن، وە لە هەوو کردەوەیەکتان ئەپرسێتەوە، سوود مەکەن، سپاردە بدەنەوە، ئەوەندەی ئێوە حەقتان بە سەر ژنتانەوە هەیە، ئەوانیش ئەوەندە حەقیان بە سەرئێوەوە هەیە.

ئەی مسڵمانینە! هەموو برای یەکن، ماڵی کەس بە کەس ناشێ، زۆر و ستەم لە یەک مەکەن، خواتان یەکە و هەموو لە ئادەمن و ئادەمیش لە گڵە، کەس لە کەس زیاتر نی‌یە مەگەر بە باشی وخواپەرستی.

دووشت لە ناوتانا بە جێ دێڵم، یەکەم قورئان کە فەرموودەی خوایە، دووهەم حدیث کە گوفتار و کرداری خۆمە، تا بە پێی ئەم دوانە بـرڕۆن زاڵ و سـەربەرز ئەبن].

ئنجا پێغەمبەر سەری بەرز کردەوە فەرمووی: خوایـە! ئـەوا فـەرموودەکـانتم گەیاند، ئنجا ئایەتی [اَلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَ أَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَ رَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلاَمَ دِيناً] هاتە خوارەوە، واتە ئەمڕۆ ئایینەکەتانم بە پایاند گەیاند، وە بەهرەی خۆمم بۆتەواو کردن، وە ئایینی ئیسلامم بە هەڵ بژاردە بۆ دانان.

پێغەمبەر لە رووی مژدەوە ئەم ئایەتەی خوێـندەوە، ئەبوبکر دەستی کـردە بـە گریان، فەرمووی: ئەمە نیشانەی کۆچی دوایی پێغەمبەرە چونکە فەرمانی خوا لە بابەت ئایینەوە کە تەواو بوو، وە بە پایان گەیشت، ئیتر پێویست نامێنێ بە ڕابەریی پێغەمبەر لە ناوەندی خوا و کۆمەڵی ئادەمیدا.

بە راستی ئەم فەرموودەی ئەبوبکرە هاتە دیی، لە پاش گەڕانەوەی بـۆ مـدینە، پێغەمبەر نەخۆش کەوت، بەو نەخۆشیەوە تا چەند رۆژێک علی و عباس مـامی ئەچوونە ژێر باڵی و ئەیان برد بۆ مزگەوت، بۆ بەرنوێژیی، لە پاشا کە لە پێ کەوت، ئنجا بەر نوێژی یکەی سپارد بە ئەبوبکر.

بەیانی رۆژی دوشەممە، دوانزەهەمی مانگی ربیع الاول، تۆزێک لەشی سووک بوو، علی و فضلی کورری عباس چوونە ژێر باڵی بردیان بۆ مزگەوت، دوای نوێژ چووە سەر منبر فەرمووی: [ئەی مسڵـمانینە هەر کەسێک دارێکم لێ داوە، ئـەوە پشتم دارە کەم لێ بداتەوە، هەرکەسێک جنێوێکم پێ داوە، جنێوەکەم پێ بداتەوە، ماڵم لە هەر کەسێک سەندووە ئەوە ماڵم لێی هەڵگرێتەوە]

لە پاشا بردیانەوە بۆ ماڵەوە دوای دووسەعات کۆچی دوایی کرد، وە ئەم سپاردە گەورەیە ـ کە ئایینی ئیسلامە ـ بۆ مسـڵمانانی بـە جـێ هـێشت وە پـەیمانی لێ وەرگرتن کە بە سەر و ماڵ ئاگاداریی بکەن، تا شەوی چوار شـەممە جـەستەی پیرۆزی لە مزگەوت دانرا، وە پۆل پۆل مسڵمانان ئەهاتن، وە بە شەرم و شکوهەوە

ئەوێستان و نوێژیان لە سەر ئەکرد و خوا حافیزیان لێ ئەکرد، شەوی چوارشەممە لە هۆدەی عائشەی خێزانی نێژرا.

بە راستی ئەم پێغەمبەرە گەورەیە، کۆمەڵی ئادەمی رزگار کرد لە بتپەرستی و دووروویی و، دووزبانی و، دوو بەرەکی و، قیین و، کیینە و، خراپـە، وە دەرگـای قورمار و، عەرەق و، دزیی و، داوێن پیسی و، پیاو کوژیی و، ناپاکـی و، دەست درێژیی و، دەست بلاویی، لێ داخستن، وە هێنانیە سەر ئیمان و، باوەررو، یەکێتی و، برایەتی و، ڕاستی و، پیاوەتیی و، دەست گرتن و، یارمەتی و، دادی کۆمەلایەتی، وە شتی پڕو پووچی هەڵگرت لە نـاوا، وە دەرگـای خـوێندن و خـوێندەواریـی لێکردنەوە، وە بە ئایەتی [إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ] هەموویانی کرد بە برای یـەک. وە جیاوازی هەڵگرت لە ناویانا، هە ژاری کرد بە هاوبەشی دەوڵـەمەند لە دارایـیدا ترازووی دادی هەڵواسی، مافی ئادەمیی دانا، خود سەریی «استبداد» هەڵگرت، وە سەرچاوەی راوێژی هێـنایە پێشەوە، ژنانی کـرد بـە هـاوبەشی پـیاوان لە ژیـانا، بەندەیی لە ناویەکە یەکە و گەلانا هەڵگرت، مافی ژن و مێردی دانا، سوود و خوێن مژیی و دەست بە سەرا گرتن «احتکار»ی قەدەغە کرد، بەزەیی هاتەوە بە کرێکار و بەردەست و ئیش کەرا، وە دەستوور و یاسای تایبەتی بۆدانان، دای بـە دەسـتی ئەوانەی کە ئەبن بە مایەی گرانیی و ئاژاوە وە بناغەی ئـاشتی دا رشت وە نـاوی ئایینەکەی نا (ئیسلام) واتە ئایینی سەلامەتی، تەمەڵـی و تەوەزەلی هـەڵگرت، وە فەرمانی دا بە کرد و کۆشیی، وە بە کشت و کاڵ و ئاوا کردنەوەی زەویی، وە بـە وەرزش و، تەندروستی و پاک و تەمیزیی، وە نوێژ و رۆژووی دانا، پایەی ژیری و بیری بەرز کردەوە، فەرمانی دا بە وورياییی و ئاگاداریی و وبێداریی لە هەموو کاتێکا، وە بە ئامۆژگاریی چاکە و جڵەوگیریی لە خراپە.

ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستە، کـۆچی دوایـی کـرد، بـێ ئـەوەی درهەمـێک یـا دینارێک، یا ناو ماڵێک، یا کـیلۆیەک زەخـیرە بـە جـێ بـێڵێ، بـەلام وەکـیتر گەورەترین دارایی و کەلە پووری بە جێ هێشت بۆ کۆمەڵی ئادەمیی، وەک ئایینی

ئیسلام و دەستووری قورئان و گوفتار و کرداری بەرزی خۆی بێ کە تا جیهان جیهان بێ، هەموو فەرموودەیەکی سەرمەشقیک، وە هەموو کردارێکی نیشانەیەکی بەرز و رووناک بێ بۆ قافڵەی ئادەمیی وکاروانی رێ بواران.

ئیتر خوا لە جیائی کۆمەڵی ئادەمیی پاداشی ئەم پێغەمبەرە بداتەوە بە پاداشێکی وا کە زێبندەی ئەو خوایە و شایستەی ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستە بێ، وە مسڵمانان بەڵکو هەموو ئادەمی بپارێزێ لە هە موو جەنگ و ئاژاوەیەک، و ئاشتی بخاتە ناویانەوە، وە سەربەستیی و سەر بە خۆییان بداتێ.

شاباشی رێت بێ گیانی هەموو کوردی خوا پەرست
هەر کەس کە پەیرەوت بێ بە هیچ نایەنێ نوشوست
ئەم دینە پاکە خوا کە بە تۆی دا دوایییە
اکملت ئایەتێکە نموونەی تەواوی یە
ئەو خوایە تۆی بە رەحمەتی عالەم کە ناردووە
اذنی شفاعتی بە لیقای تۆ سپاردووە
دیارە کە تۆش ئەمەندە لە لای خوا بە حورمەتی
رۆژی قیامەتیش بە تکای (رب امتی)
ئەم امەتەکە غەرقی گوناحە بە بێ شعور
لێیان دەبووری خوا بە تکای تۆ بە بێ فتور
چەن خۆشە خۆشەویستی لە لای گەورە هێندە بێ
مایەی سروشتی هەر دو جیهان بێت و بە ندە بێ

تەواو بوو

ووتارێکی شێخ محمدی خاڵ دەربارەی پێغەمبەر کە لە کۆرری ئەم مەولود نامەیەدا خوێندوویەتەوە

## پێغەمبەر

هەموو پیاوێکی گەورەی هەل کەوتوو لە جیهاندا، کەلیی وورد ئەبییتەوە و مێژووی ژیانی ئەخوێنیتەوە، تێ ئەگەیت کە گەورەیی و بلیمەتی یەکەی هەر لەیەک رووەوە بووە، وەک (سقراط) و (فیثاغورث)ی یۆنانی و (کنفیسوس)ی چینی و (شاملیون) ئەمریکائی و (میرابۆ)ی فرنسی و (گاریبالد)ی ایتالیایی و (گوتم)ی هیندی کە هەریەکێک لەمانە لە تاقە شتێکا پسپۆرر «متخصص» بووە.

بەلاّم گەورەیی پێغەمبەر (درروودی خوای لێ بێ) وەک گەورەیی جیهانی بێ پایان وایە، ئەم پەررو ئەو پەرری نابینرێ، وە بییری مەردوم ناتوانی دەوری بدات، هەرۆژەی گۆشەیەکی بۆ زانایان دەر ئەکەوێ، وە هەر دەمەی لایەکی بۆ دانایان ئاشکرا و نمایان ئەبێ، کە وابوو مەردوم نازانێ لە چەروویکەوە لێی بدوێ.

ئەگەر تەماشای میهرەبانی و، لێ بوردن و، راستی و، چاوپۆشیی و هێمنی و، پیاوەتی و، سەنگینی و، بێ دەماریی و، دڵ نەرمیی و، زمان شیرینی و، لە سەر خۆیی و، دەست و دەم ودڵ پاکیی و، ئازایی و نەبەزیی و بەر چاوتێریێ و، مەردووم نەوازیی و، داد پرسیی و هەزار پەروەریی ئەکەیتە ئەڵێت ئەم پێغەمبەرە یەکەمیین کەسێکە لە جیهانا کە سەرچاوەی رەووشت و خووی شیریین، وە سەرمەشقی رەفتار و، گوفتارو، کرداری رەنگیین بووە.

ئەگەر ئەماشای ژیریی و بییری بەرز و، رامیاریی «سیاسة» و رێک خستنی ئەم هەمو ئیش و کارە گەورە گەورانەی ئەکەیت، کە لە ماوەی بیست و سێ سالاّ کردوونی، وەهەموو عێل و، تیرە و هۆز و، خێڵ و، نەتەوە و بنەچە و، خێزانی عەرەبی پێکەوە نووسان، وە کردنی بە کۆمەڵێکی یەک دڵ و یەک بییر و یەک ئامانج، وە هەرچی ناکۆکیی و دووبەرەکیی و، ناپاکی و نامەردیی هەبوو لە ناویان هەڵی گرت، وە گەلێک و دینێک و دەوڵەتێکی دروست کرد، وە سەرەرای ئەمانەش بەشی زۆری ئادەمیی کرد بە برای یەک، بە رەنگێکی وا ئەگەر لە مەراکیش زۆر

وستەم لە مسڵمانێک بکرایە لە ئەندەنوسیا بۆی خەفەتبار ئەبوون، ئەگەر تەماشای ئەمەی ئەکەیت ئەڵێیت: ئەم پێغەمبەرە یەکەمیین سیاسی‌یەک بووە لە جیهانا کە هەموو ژیانی خۆی بەخت کردووە هەر لەرێی ناسینی رەوشت و خووی ئادەمیی‌دا، تا بزانی کە بە پێی سروشتیان قسەیان لەگەڵ بکات، وە بچێتە ناو دڵ و دەرونیانەوە

ئەگەر تەماشای خواپەرستیی ئەکەیت کە بە رۆژ بە رۆژوو بووەو،بە شەو شەونوێژی کردووە، وە ئەمەندە لە نوێژا بە پێوە وێستاوە، تا پێی هەموو ئاوساوە، وە لە سەعات زیاتر لە سجدە داماوەتەوە و سەری بەرز نە کردۆتەوە، ئەڵێیت ئەم پێغەمبەرە یەکەمین خواپەرست بووە لە جیهانا، وە هیچی‌تری نەزانیوە تەنیا خواپەرستی نەبێ.

ئەگەر تەماشای ئامادەیی و شارەزایی ئەکەیت لە دانانی پلانی جەنگا کە چۆن هاورێکانی رێک خستووە و دای مەزراندوون، وە کۆمەڵ کۆمەڵ بە پێی شوێن دابەش دابەشی کردوون وە لە کاتی گەرم بوونی جەنگا خۆی چۆن وەک سەر کردەیەکی جەنگیی چۆتە بەرەوە و سنگی داوەتە پێشەوە، ئەڵێیت ئەم پێغەمبەرە یەکەمین جەنگاوەرێکی لەشکر شکێن بووە، وەهەموو ژیانی خۆی هەر لە جەنگ‌دا بەخت کردووە، وە هەر لەم رووەوە بە هرەمەندبووە.

ئەگەر تەماشای دەستوورو فەرمایشاتی ئەکەیت کە لە بابەت پاشەکەوتی‌یەوە فەرموویەتی بە گوفتارێکی رێک و پێک و دڵ چەسپی‌وا، کە بچێتە دڵ و دەرونی هەموو کەسێکی دەست بڵاوی بەرچاو فراوانەوە، ئەڵێت ئەم پێغەمبەرە یەکەمیین زانایەکی ئابووریی و پاشەکەوتیی بووە کە هەموو ژیانی خۆی هەر لەم رووەوە بەخت کردووە.

ئەگەر تەماشای جمعە دوانگەی دواندەریی «منبری خطابە»ی ئەکەیت کە هەزار و چوار سەد ساڵ لەمەو پێش دای‌ناوە، وە وورد ئەبییتەوە لە ووتاری رەنگا و رەنگ و، گوفتاری گەرم و گورری، لە سەر ئەم دوانگەیە وە لە ناو کۆمەڵانی گەورە گەورەدا کە داویەتی، وە چووەتە ناو دڵ و دەروونیا نەوە و کاری تێ

کردوون، بە رەنگێکی وا کە زۆر لە گەورە و، سەر کۆمارە کـانی عـەرەب نـەیان وێراوە بچنە کۆرری پەند و ئامۆژگاریی‌یەوە، نەوەک دڵیان نەرم بێ و مسڵمان بن، ئەڵێت ئەم پێغەمبەرە یەکەمیین دوانـدەر «خـطیب» بـووە لە جـیهانا، وە هـەر لە ورووەوە پسپۆرر بووە.

ئـەگـەر تـەماشای پـەزیشکی و حکـیمیی ئـەکـەیت لەو کـاتی نـادانـیی و نەخوێندەواریی‌یەدا، وە لەو چۆڵـی گەرمی عەرەبستانەدا، کە هەرچی خـوێندن و خوێندەواریی بێ تیا نەبووە، وە سەرنج ئەدەیت لەو دەستورە جوان جوانانەی کە لە تەندروستی‌دا دایناوە، وە تازە دۆزراونەتەوە، ئـەڵێت ئـەم پـێغەمبەرە یـەکـەمیین حەکیمێک بووە لە جیهانا کە هەموو ژیانی خۆی بەخت کردووە لە دۆزیینەوەی نەخۆشیی و دەرمان بۆ دانانی، وە هەر لەم رووەوە زانایەکی هەڵکەوتوو بووە.

ئەگەر تەماشای ریازات و فلکیاتی ئەکەیت کە چۆن قسە ئەکات لە ئاسمان و زەویی و رۆژ و مانگ و ئەستێرە و بوونیان و، رووناکـیی‌یان و، هـات و چـۆو، چەرخە و، خول خواردنیان، ئەڵێت ئەم پێغەمبەرە یەکەمین فلکی یـەک بـووە لە جیهانا، وە هەر لەم رووەوە زانا و شارەزا بووە.

ئەگەر تەماشای زانیینی چۆنێتی گۆررانی هەوای ناو ئاسمان «علمی طقس و طبقاتی جو»ی ئەکەیت کە چۆن قسە ئەکات لە هەورو سایەقەو، بەفرو، بارانـو، تەرزە و، هەورە تریشقە، ئەڵێیت ئەم پێغەمبەرە یەکەمیین زانایەکە لەو علمەدا، وە بارەها خۆی بە فورۆک سەرکەوتووە و بە راووردی لای ژووروویی کـردووە، وە هەر لەم رووەوە ئاگادار و پسپۆرر بووە.

ئەگەر تەماشای دانانی ئەو دەستوورو یاسا جوانانەی ئەکەیت کە دای‌ناوە، وە سەراسەر مایەی بەختیاریی و کامەرانیی ئادەمیین، ئەڵێت ئەم پێغەمبەرە یەکەمیین قانونی‌یەک بووە لە جیهانا، وە هەرچی ژیانی خۆی هەیە بە شەوو بە رۆژ بەخت کردووە لە دۆزیینەوە و دانانی ئەو یاسایانەدا، وە هەر لەم رووەوە هـەڵ کـەوتوو بووە.

ئەگەر تەماشای محاکماتی ئەکەیت کە هەمیشە مسڵمانان پرسیاریان لێ کردووە لە بابەت نوێژ و رۆژوو، حج و، زەکات و، کررین و، فرۆتن و بارمتە «رهن» و، اجارە و، نکاح و، طلاق و، عدە و، نفقە و، و رضاع و بەش کردنی کە لە پوور و میراتو، دعوا و، بینات و، قصاص و، جنایاتەوە و وەرامی داونەتەوە، ئەڵێت ئەم پێغەمبەرە یەکەمیین حقوقیەک بووە لە جیهانا، وە هەموو ژیانی خۆی بەخت کردووە لە زانستکە لە «کلیە»ی حقوقا، وە هەر لەم رووەوە هەڵ کەوتوویەکی بێ هەمتا بووە.

ئەگەر تەماشای جوانیی پەروەرش و بەرهەم هێنان «تربیة و تعلیم»ی ئەکەیت، کە ژنی وەک حەزرەتی عائشەی پێ گەیانووە، کە لە دوای کۆچی خۆی لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بووە کە چی نیوەی ئایینی ئیسلام لە دەمی ئەوەوە وەرگیراوە، وە هەرشتێک کە هاورێ گەورەکان نەیان زانیایە ئەچوون و پرسیاریان لەو ئەکرد، وە پیاوی وەک حەزرەتی ابوبکر و عمر و عثمان و، عەلی و، عباس و، معاویەو، عمروی کورری عاصی پێ گەیاندووە کە هەموو روو پەررەی مێژووی جیهان بە زانایی و، دانایی و زرنگیی و هوشیاریی و، ژیریی و، کارزانیی و، داد و کارامەیی ئەوان پرر کراوەتەوە ئەڵێی ئەم پێغەمبەرە یەکەمیین کەسێکە لە علمی پەروەرش و بەرهەم هێنانا کە وا ئەو عەرەبە نادانانەی پێ گەیاندو پەروەردەی کردن، وە بە رووناکیی ئایینی ئیسلام، شرینقەی لە مێشکیان دا، تا سەر و ماڵی خۆیان بەخت کرد لە رێی ئایینی ئیسلاما، وە لە ژیانی پێغەمبەرا عەرەبستانیان پاک کردوە لە بێگانان، وە لە دوای کۆچ کردنیشی بە حەفتا هەشتا ساڵ بەیداخی اسلامیان هەڵدا لە چینەوە تا أسپانیا و قەراغی دەریای اطلس، وە لە قازانەوە تا دەریای هیند، کە هەموو مێژووشناسی جیهان وە هەموو فلاسفە و زانایانی کۆمەڵایەتیی «علمای اجتماعی» کاس و سەراسیمەن لە مایەی ئەم بەلا و بوونەوەیە لەو چەن ساڵە کەمەدا، ئەمانە هەمووی بە هۆی ئەو پەروەرش و بەرهەم هێنانەوە بووە کە ئەو پێغەمبەرە گەورەیە کردوویەتی، هەر بەم رەنگە لە هەر گۆشەیەکەوە کەوورد ئەبیتەوە لە گەورەیی پێغەمبەر، ژیری و بیرپەیی پێ نابات، وە ناتوانێ بە دەوریا بسوورێتەوە.

کە وابوو پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ)، لە یەک کاتا خواپەرست و گۆشەگیر و، سیاسیی و، سەرباز و، فەرما دەر «قائد» و، دوواندەر «خـطیب»و، پـەزیشک «طبیب» و، زانایەکی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و یاسایی و، فلکی و، ریـاضی و، مرشد و، مربی و، دادەوەر «قاضی) و، پێشەوا «امام» و، پاشایەکی گەورە بـووە، هەروەک پێغەمبەرێکی خاوەن قرآن و پایە بەرزیش بـووە، کـە وابـوو دەریـای گەورەیی و زانایی پێغەمبەر ئەمەندە فراوان و بێ پایانە ئـەگـەر هـەزاران زانـا و فیلسوف و هەڵ کەوتووی جیهان داوێنی لێ هەڵ کەن ئەم پـەررو ئـەو پـەرری ناکەن،

چ بەڵگەیەک لەم بەڵگەیە گەورەتر و بە هێزتر هەیە؟ لە سەر پێغەمبەرێتی ئەم پێغەمبەرە، نەخوێندە وارێکی جیهان نـەدیدەی هـەژاری، بـێ پشـتیبوانـی، پـێ گەیشتوو لە دەشتی چۆڵی گەرمی عەرەبستانا، لە ناو هۆزێکی جانەوەری، کێویی، بتپەرستی، بێ وێلی، بێ رەووشت و خووی خاوەن پرر و پووچا انقلابێکی وا بە سەر ئادەمیی دابێـنێ لە ماوەیەکی زۆر کەما هـەرچـی بـاو «عـادة»ی ئـایینی و کومەلایەتی بەشی زۆری گەلانی سەر زەویی هەیە هەڵی گرێ، وە باوی ئایینی و کۆمەڵایەتی خۆی لە ناو دڵ و دەروونیانا برروێنێ و جێ گییر بکات، وە بگات بە پایەیەک حەوت سەد ملیون ئادەمیی لە هەموو گۆشە و کە نارێکی سەر زەویی یەوە شەوو رۆژی پێنج جار لە نوێژا ناوی بەرامبەر بە ناوی خوا ببەن، وە گەواهیی لە سەر پێغەمبەرێتی بدەن، وە هەرچی زانا و فیلسوفی تێ گەیشتووی، بـە ئـینصاف هەیە لە کاتی ناو بردنیا سەری شەرم و حەیای بۆ دابنەوێنێ.

# مەولود نامەی

# ـشەمسـ

هونراوەی:
ماموستا سەیید بهاءالدینی
شەمس قورەیشی

عبدالرحیمی مەحموودی
هێناویەتە سەر شێوە نووسینی کوردی

سنندج چهار راه شهداء پاساژ عزتی انتشارات کردستان
تلفن: ۲۲۶۵۳۸۲

بسم الله الرحمن الرحیم

یــا ذاتــی بـێ چــوون واجب الوجـود
یــا قــایم بــە ذات قــەدیمی مـەعبود
بۆ کونهی ذاتت خۆ کـەس پـەی نـەورد
حـەمد و ثـەنای تـۆ لایـق تـۆ نـەکـرد
ئــێمە حــادثین تــۆ قــەدیم بــە ذات
حادث لە قـەدیم دەرکـی چـی دەکـات
چەند بـازی تـیژ بـاڵ لەم هـەوا پـەڕی
ســووتیا، وە بـرقی لاٰ أُحْــصي پـەڕی
هیچکەس وەک حەزرەت لەم مەیدانـەدا
تــەوسەن عــیرفانی وە جـەولان نـەدا
بــــە مـا عَـرَفْناكْ لە کــونهی ذاتـا
بــــە لاٰ أُحْــــصي گــۆلەتەی صــیفاتا
لە عــەبدی یــەتدا بــە مـا عَـبَدْناكَ
گــــرتی لیگــامی تــەوسەنی إدراک
بــەو عــیرفانەوە ئـەو بـێ مـەجاڵ بـوو
تـەی ئـەم مـەیدانـە ئـیتر مـەحاڵ بـوو
مــای مـا عَـرَفْناك عــیرفانی لابـرد
نــەفی ئــیدراکــی لە مــا سیوا کـرد
وە لای لاأُحْصي حـەبسی کـرد نـەفەس
رێگــەی ئــینتهای ثـەنای بـردە بـەس
وە مای ما عَبَدْ، عـەبدی کـرد بـێ دەس
عِـبادەت وە حـەق نـاکـرێ بـۆ کـەس

ناگەیێ وە ذەیل وەصفی، دەستی کەس
کۆتا و موختەصەر شەمسا ئیتر بەس
خودا، خودایە باسی کۆتا کەین
سەیری سواری شەوی ئیسرا کەین
عالەم بۆ خاتر ئەو ئەر نەبوایا
لە چای عەدەم دا دەبوا بمایا
سەوادی رەقەم ئیجادی عالەم
کەی جاری دەبوو بێ میهری خاتەم
وەها کە فەرموی خالقی بێ باک
لَوْلاکَ لَمَا خَلَقْتُ الأفلاک
لە بۆ نەی خاتر ئەو ذاتە تەنیا
ئەم بەزم و بادە و بیساتە چنیا
ئەو رێگەی راسی نیشان دا پێمان
نەچین بۆ هەڵەت بلەغزێ پێمان
دەیسا لە دەریای رەحمەکەی باری
صەڵوات و سەلام وە جارێ جاری
با بێ بوێ جەم گشتی لە سەردا
گۆل، گۆل لە رەوضەی فەخری بەشەردا
لەو دوا سەروازکا لەوێ گولاوی
بۆ باغچەی ئەرواح ئال و ئەصحاوی
تیعدادی نەفەس نفوسی عالەم
صەڵوات بێ لە سەر رەسوولی خاتەم

**جێگای خوێندنەوەی قەصیدە و موناجات**

مەجلیس فەرەح بەخش وەصفی حەزرەتە
مەظهەری ئەنوار فەیض و رەحمەتە
وە ذیکری صەڵوات پاک لە ئالایش
با فەضای مەجلیس بدەین ئاڕایش
هەر کەس خۆش ئیقباڵ خۆش سەعادەتە
طالب شەفاعەت شای شەفاعەتە
گۆی بگرێ ساتێ ذیکری مەولوودە
مەولوودی حەبیب حەیی مەعبودە
بەیان کەین لەباس خیلقەتی ذاتی
شەرحی شەمایل، حوسنی صیفاتی
ئەوەڵ با بێژین لە خەلقی عالەم
تەمهیدی ظوهور، رەسوولی خاتەم
حەق چوون لە سەر تەخت کیبریا و عیزەت
کەنزێ بوو مەخفی ئەو ذاتی وەحدەت
مەیلی کرد تا نوور مُقدّسەی ذات
بێ چوون و چرا دوور لە کەیفیات
لە پشتی پەردەی تَجَلاّی ذاتی
جیلوە دا ئەسمای حوسنای صیفاتی
بۆ ناسین وە خەلق تا خۆی نیشاندا
لامع بوو وە سەر کەون و مەکان دا
«فَاَحْبَبْتُ اَنْ اُعْرَفْ» پەیدا بوو
حیجابی «کَنْزاً مَخْفیاً» لا چوو
«خَلَقْتُ الْخَلْقَ لِکَیْ اُعْرَفْ» هات
عالەمی لە کەتم عەدەم دا نەجات

دانـــــه‌ی نـــــاسفته‌ی عـــــاله‌می ئـیمکان
له کـــانی عـــه‌ده‌م بـــۆ خـــۆی بـوو پـه‌نهان
بۆ نووکی ئـه‌ڵماس «كُـنْ» کـه ده‌ستی بـرد
دانـــه‌ی نـــاسفته‌ی وه «كُـــنْ» کـــونا کـــرد
وه «كُـــنْ» عـــاله‌می بـــو لـه‌ندی و پـه‌ستی
هـــاوردی له «كُـــنْ» نـیستی وه هـــه‌ستی
وه چـــــاوی قـــودره‌ت ئـیراده‌ی قـیده‌م
کـــردی یـــه‌ک نـه‌ظه‌ر بـۆ فـه‌ضای عـه‌ده‌م
هـــــه‌ڵ قـــوڵیا و کـــوڵیا تـــه‌واو کـــاینات
پوخته‌ی خیلقه‌ت بوو، ئه‌شیای مـه‌وجوودات
رژیـــــا، وه ئـــه‌طراف فـــه‌ضای عـــه‌ده‌م‌دا
لای دا ســـــه‌ر کـــــه‌فی وه‌لای ئـــاده‌م دا
وه‌خـــتێ خـــیلقه‌ت بـــوو تـــه‌واوی عـــاڵه‌م
مـــــوکه‌ڕه‌م له گشت ئـــــولادی ئـــــاده‌م
خـــــیلقه‌تی عـــــاڵه‌م دایـــــره‌ی کـــه‌ماڵ
مـــه‌رکه‌زی مـــوحیط روخســـاره‌ی جـه‌ماڵ
صـــــووره‌ت و ســـیمای شـــیرین عـــه‌لایم
قـــامه‌ت خـــۆش ئه‌ندام ئـه‌حسه‌ن قـه‌وایم
تـــــه‌رکیبێ عـــــه‌جیب «بـــدیع البـــنیان»
عـــه‌طای کـــرد خـــالق بـه نـه‌وعی ئـینسان
لوطـــــفی ئـــــه‌زه‌لی خـــــالقی ئـه‌کـبه‌ر
مـــــمتاز بـــــوو له‌وان ئـــه‌نبیا یـــه‌کســـه‌ر
بـــــۆ ره‌هـــــنمایی له نـــــه‌وعی بـــــه‌شه‌ر
مُـــعیّن کـــریان جـــــه‌معێ پـــێغه‌مبه‌ر

ئــــــەفضەڵ‌تر لە گشت تـــــەواو ئـــــەنبیا
حـــــەزرەتی رەســـــوول شـــاهی ئـــەصفیا
چـــەندین هـــەزار ســاڵ بـەر لە مـەوجودات
خـــەلقی کـــرد نـــووری فـــەخری کـاییـنات
نـــــەبوو لە پـــورگار پـــەڕەی «کُـنْ فَکْـان»
نـــیشانەی نـــەقشەی دایـــرەی ئـــیمکان
ئـــــەول نـــــوقطەیە لە نـــــووکی قـــەڵەم
تـــیکا وە ســـــەر لەوح ئـــیجادی عـــالەم
جـــــاری بـــوو قـــەڵەم قـــودرەتی ئـــەزەل
خیلقەت بوو نـووری مـوصطەفای مـورسەل
ئـــەوەڵین ئـــیجاد کـــارخـــانەی خـــیلقەت
حـــــەقیقەتی نـــوور، وجـــودی حـــەزرەت
نـــــەبوو ئـــەغیارێ مـــەخلوق لەو بـــەینا
ئـــەوی مـــمتاز کـــرد، وە ســـەر کـــەونەینا
ئـــەشرەف و ئـــەفضەل وەک ئـــەو گـوزیدە
نـــەی کـــرد لە مـــەخلۆق کـــەس ئـافەریدە
خـــەلقی کـــرد لە خـەلق عـالەم گشت جـیا
ئـــــــــیسمی شـــــــــەریفی مـــــحمّدنیا
«کُنْ عَبْدِي» [1] مە خصوص خیطابی لێ کـرد
ئـــــەعلا مـــــەقامی عـــــەبدی‌یەتی بـــرد
ئــــەو نــــووره «لَــبَّیْک» جــوابـــی داوە
مـــەشغول بـــوو وە حـــەمد ذاتـــی خـوداوە

١ـ یانێ بە تایبەتی خوا پێ فەرموو تو عەبدی من بە.

له دوازده حـــــيجاب ئـــەو گـــرتی قـــەرار
وه ذیکـــــری تـــــەقدیس ذاتـــی کـــردگار
حـــیجابی قـــوردەت حـــیجاب ســـەعادەت
حـــــیجابی مِـــنّت حـــیجاب شـــەفاعەت
حـــیجابی رەفـــعەت حـــیجاب کـــەرامـەت
حـــیجابی رەحـــمەت حـــیجاب هـیدایـەت
حـــیجابی طـــاعەت حـــیجاب عـــەظەمەت
حـــــیجاب مـــەنزیلەت حـــیجاب نـــبووەت
له هـــەر حـــیجابێ چـــەندین هـــەزار ساڵ
مـــەکـــثی کـــرد بـــه ئـەمر ذاتـی بـێ زواڵ
حـــەق هـــەم لەو نـــووره ئـــەمری کـردەوه
له نـــــاو، دەبـــه حـــرا غـــووطەی بـــردەوه
له هـــــــەر بـــــحرێکا غـــوطەوەر دەبـــوو
مـــەخصوص وه گـەوهەر وەصـفێتر دەبـوو
لەو تکـــــیا عـــــەدەد ئـــەنبیای ضـــەروور
صـــەد و بـیس وچـوار هـەزار قـەتره نـوور
لەو قـــەتره هـــەر یـــەک ئـــەنبیای کـیرام
خـــەلقی کـــرد خـــودا بـــۆ روتـبه و مـەقام
بـــاز هـــەم لەو نـووره خـەلقی کـرد دەردەم
عەرش و کورسی و لەوح، هەم له گەڵ قـەڵەم
ئـــەمری کـــرد قـــەڵەم بـنویسه ئـەل ئـان
تـــــەواو تـــــەقدیرات تـــا ئـــاخر زەمـــان
وه ســـــەر لەوحدا جـــــاری بـــوو قـــەڵەم
نـــــووسی تـــــەقدیرات تـــەواوی عـــاڵەم

نـــووسی بــۆ ئـوممەت تـەواو ئـەنبیا
هـەر کـام پـا لە ڕێ شـەرعی کـەچ نـیا
دەبـــی بســـووتێ ئـــەهلی عـەزابـە
صــاحب شــەقاوەت حـاڵی خـرابـە
هـــات بـۆ ئـوممەتی ڕەسـوولی زەمـان
بـنووسێ هــەروەک بـاقی ئـوممەتان
نــیدا هـــات لە حـەق قـەڵەم بـوێسە
بـۆ ئـوممەت حـەزرەت وەهـا بـنویسە
ئـوممەت ئـەو ئـەگـەر لە طـاعەت دوورە
ئـــەوان مــوذنێبن خـــودا غــەفوورە
ئـەمە هـەر لە بـەر شـەرەف حـەزرەتە
ڕەحـمی کـرد خـودا ئـەو بـەم ئوممەتە
بـۆچی جـا سـەجدەی شـوکرانـەی نـەبەین
دایــم، شـەوو ڕۆژ صـەڵواتـی نـەدەین
(شـەمس) وە سـەرگـەرد ئـەبرۆی تـاقی بـێ
ڕۆحـی فـیدای گـەرد پـای بـوراقـی بـێ
تـیعدادی خـــەلقی ئـەزەل تـا ئـەبد
سـەڵوات بـێ لە سـەر سـەییدی سـەرمەد

**(جێگای خوێندنەوەی قەصیدە و موناجات)**

فـەضیلەت ثـواب مـەولوودی حـەزرەت
ثـابتە وە قـەوڵ عـولەمای ئـوممەت
گـەیگە وەتـەحقیق ثـوابـی فـەرەس
هەر کـەسێ هـەرچی لە بـۆی بـدا دەس

هـــیچ نـەکـا دریـغ بـیٚ حـەیف و مِنّت
صەرفکا لە ڕێگەی مـەولوودی حـەزرەت
بـــۆ بـــیٚ ئـــیقیتدار نـــاوی مـــویە سـەر
هـــیچ لازم نـــاکـــا جـەمکا سـەد نـەفەر
غـــەرز هـەر قـەصدی بـۆ پـێغەمبەر بـیٚ
ســـەد نـەفەر نـەوی یـا سـی نـەفەر بـیٚ
ئاوازەی مەولوود بەرز بـوو لە هـەر مـاڵ
مـــەلەک ئـــەپۆشیٚ ئـــەو مـــاڵە وە بـــاڵ
مـــەحفوظ دەمـــێنیٚ لە دەرد و زەحـــمەت
دەڕژیٚ وە ســـەریا بـــارانـــی رەحـــمەت
صـــاحب ئـــەو مـاڵە تـا عـومری ماویٚ
دوچـــــاری دەردی مـــوحتاجی نـــاویٚ
جـــەمعیٚ لە ئـــیجماع عـــولەمای کـوببار
دەفەرموون مـەولوود رەسـوولی مـوختار
هـــەرکەسیٚ هـەر سـاڵ بـیکا وە عـادەت
نـامریٚ ئـەو کـەسە غـەیر وە شـەهادەت
نـــــەقڵی بـــــوولەهەب دوای مـــــردنی
شـــــاهیدە لە بـــــۆ ثـــــواب کـــردنی
شـەخصیٚ مـوعتەبەر ئـەوی لە خـەو دی
ســـوئالی لی کـــرد بـــۆ نـــیک و بـــەدی
ووتـــــی ئـــــیمانت تـــۆ، وە پـــێغەمبەر
نـــەبوو تـــا دەرچـــوی لە دونـــیاوە دەر
عـــەذابت چـــۆنە مـــردی بـــیٚ ئـــیمان
بـــێژە بـــزانـــم مـــەعلووم بـــیٚ لێـــمان

ووتـــــی حـــــاڵەتم تـــا بـیێژی بـــەدە
عـــەذابـم تـەواو سـەخت و بـێ حـەددە
مەگـەر لە شـەوی دووشـەممەی شـەریف
لە سـەختی عـەذاب بـۆم بـۆی تـەخفیف
ئـــاوێ خـــۆش گـەوار لە لوطـفی بـاری
بـۆمن لە ئـەنگوشت خـۆم دەبـێ جـاری
دەیـــنۆشم عـــەطەش مـن سـاکـن دەوی
غەیر شەو دووشـەممە نـیە هـیچ شـەوێ
لە شەو دووشەممە حـەزرەت بـوو پـەیدا
ثـــویبەی جـــاریەم مـــوژدەی وە مـن دا
لەو مـــوژدە کـــە ئـــەو بـۆ مـنی هـاورد
وە فـــەوری مـــنیچ ئـــەوم ئـــازاد کـــرد
ســـەبەب راحـــەتیم لە شـەو دووشـەممە
هـــــیچێ‌تر نـــــیە بـــــغەیرەز ئـــــەمە
لەم بـــەحثە ابـــن جـــەوزی دەفـــەرموو
خـــۆ ئـــەبوولەهەب مـــوسوڵمان نـــەبوو
چوون ئـەو جـاریە مـوژدەی بـۆ هـاورد
خوشنود بۆ و فـەوری ئـەوی ئـازاد کـرد
شـەوی دووشـەممە لە یـومنی حـەزرەت
خـــودا لە گـــەڵ ئەو وا دەکـا رەحـمەت
پەس ئـەر مـوسوڵمان بـەذلی مـاڵی کـرد
نـاوی وە مـەولود فـەخری بـەشەر بـرد
یـــــەقینت وابـــێ هـــیچ شکت نـــەوێ
بـــێ عـــەذاب داخـــڵ وە جـەنەت دەوێ

وەختێ لە مەککە حەزرەت پەیدا بوو
بیس و پەنج لە ساڵ عومری وە سەر چوو
مایل بوو وە ئەو خەدیجەی کوبرا
بۆ حەزرەت عەقدی موبارەک کرا
دوای سی و پەنج ساڵ عومری دا بگرد
قورەیش تەعمیری ماڵ کەعبەیان کرد
لە نەصبی حەجەر بۆ عەقل و ئەدەب
ئەویان کرد حەکەم گشت خێلی عەرەب
وابوو حیکمەتی لە نەصبی حەجەر
خوشنود بون عەرەب قەبایل یەکسەر
چل ساڵ لە عومری تەواوی بگرد
بۆ لای ئەو جبریل حق نازڵی کرد
لە غاری حیرا جبریل وەلای هات
مەبعووث بوو لە سەر تەواو کاینات
رۆژی دووشەممە حەفدەی رەمەزان
بوو وە پێغەمبەر لە سەر ئینس و جان
دوای بیعثەتی پەنج ساڵی بگرد
بۆمیعراج خودای ئەوی طەڵەب کرد
دوازدە ساڵ تەواو بگرد لە بیعثەت
تەشریفی هەر بوو لە مەککە حەزرەت
لە ساڵی سیزدە، ربیع المولود
شەوی دووشەممە موبارەک ورود
لە مەککەی شەریف ئەو هیجرتی کرد
لە بۆ مەدینە تەشریفی هاورد

ڕەفیقی هیجرەت لە صەحبی کوبیار
ثَانِی اثْنَیْنِ اِذْهُمَا فِی الْغَار
ڕۆژی دووشەممە سەییدی سەروەر
وارد بو وەشار مەدینەی ئەنوەر
تاریخی ئیسلام لەو ڕۆژە وە بوو
کە ئەو تەشریفی لە مەککە دەرچوو
موددەی یازدە ساڵ بوو لە مەدینە
تەکمیل بوو تەواو ئیحیای ئەم دینە
لە ساڵی یازدە فەرموودەی ئیجماع
کردی بۆ ڕیحلەت پێغەمبەر ویداع
فەرمایش دەکا فاتیمەی بەتوول
من بووم لە باڵین حەزرەتی ڕەسوول
قابض بۆ لای ئەو تەشریفی هاورد
ویسا لە قاپی ئیذنی طەڵەب کرد
صەدایدا ئەدەب وتی السّلام
یا ئەهلە بەیتی «نبیّ الأنام»
ئایا مەئذونم داخڵ بم وە ماڵ؟
بپرسم لە حاڵ ڕەسول ئەحواڵ
نەمزانی ئەوە جوابم داوە
ئەجرت زیاد بێ وەلای خوداوە
لەم وەختا ڕەسوڵ حاڵەتی سەختە
هاتن عەیادەت بۆلای نا وەختە
حەزرەت صەدای دا فاتیمە ئەطهەر
مەگەر نازانی ئەو شەخصە لە دەر

حــەزرەتی قــابض، قــەبضی رۆحــانە
مــــەئذونە بــــا بــێ وە مــن مــیهمانە
داخــڵ بــوو قــابض وە شــەرم و حــەیا
کـــــردی ســــەلامی فــەخری ئــەنبیا
جــوابــی دا رەســـوول عــلیک السّلام
یـــــا آمـــــین الله خـــەیر هــاتی وەلام
قابض عـەرزی کـرد رەسـوولی سـەروەر
قــەسەم بــە عـیزەت خـالیقی ئـەکبەر
لەو سـاوە مـەئمور قَـبضی رۆح بـووگم
غەیر بۆ تۆ وە ئیذن لای کەس نـەچووگم
رۆژی دوازدەی ربــــــیع الأول
دووشـەممەی شـەریف تـەقدیری ئـەزەل
ریـــحلەتی فــەرموو لە دونــیای فــانی
واصــڵ بــوو وە نـوور لیـقای رەحـمانی
شەصت و سێ ساڵ بوو عومری شـەریفی
وا لە مـــەدینە مـــەرقەد ظـــەریفی
وە بــیست و ســێ ســاڵ لە کـوفر و بـەلا
ئـــاییىنەی ئـــایین دیــــنی دا جــەلا
مــەدفوونن رەفــیق دونـیا و هـەم دیـنی
بــوبکر و عــــومەر لە لای پــاییىنی
حــەزرەتی عـیسی فـەوتی بـۆ بـۆی
ئـەویچ هـەر دەفـنی لەو حـوجرە دەوێ
مــابەینی قــەبرو مـینبەری حــەزرەت
هەیە یەک رەوضە لە رەوضـەی جـەنەت

لە تـــەحتی زەوی تـا فـەوقی سـەما
صـەڵوات بـێ لە سـەر فـەخری ئـەنبیا

(جێگای خوێندنەوی قەصیدە و موناجات)

مـوعجیزەی حـەزرەت رەسـوولی زەمـان
تـــیعدادی دوورە لە شـــەرح و بـەیان
ئـیعجاز بـۆ تـەصدیق دەعـوای پـێغەمبەر
حـەیوانـە و نـەبات جـیمادە یـەکسـەر
جـاری بـوون ئـاوی زلال لە ئـەنگوشت
تـێر ئـاو لەو ئـاوە سێصەد نـەفەر گشت
ئیحضاری ئـەشجار هـەم ئیحیای ئـەموات
هـاتن بـۆ لای ئـەو وشـتر بـۆ شکـات
نـاڵینی سـتون تـەکـیەگـای مـینبەر
لە دەردی هـیجران دووری پـێغەمبەر
سەنگ و هەم درەخت لەو سوجدە و سەلام
لە کـەفیا تـەسبیح سـەنگریزە و طـەعام
سـایەی لە کـەی هـەور چـتری لە گـەرما
دەرهـاتن لە سـەنگ ئـاوی گـەوارا
لە بـەعضێ غـەزا تـەشریفی دەچـوو
بـۆ کـۆمەک مـەلەک بـۆی حـازر دبـوو
شـیفا دان ئـەمراض، خـەبەر دان لە غـەیب
مـوخبری صـادق، بـێ شک و لارەیب
موعجیزەی مەخصوص بۆ خۆی جـیا بـوو
هـەم دارای ئـیعجاز گشت ئـەنبیا بـوو

بــــەڵاّم ئــیعجازێ لە بــۆ ئــەو بــووگە
بــــۆ بــاقی ئــەوان هــیچکام نــەبووگە
وەک شَــقُّ القَــمَر فــەصاحەت قــورئان
عــــوروجی مــیعراج تــاوە لا مــەکــان
هەم بـەعضێ خـەواص مـەخصوصی ئـەوە
هــــیچکام ئـــەنبیا نـــەی بـــووگە لەوە
وەک روئیەت صـوورت خـلیقەتی جـبریل
وەک هـاتن بـۆ لای حـەزرەت ئـیسرافـیل
هــەم وەک شـەفاعەت کـوبرا لە مـەحشەر
یا وەک لیوای حەمد هەم حەوضی کـەوثەر
بــەر لە گشت پــوشین حِــلّەی إِسْــتَبرق
هەم روئـیەت جـەماڵ لیـقای ذاتـی حـەق
بــوراق هــەم مـەخصوص ذاتـی حـەزرەتە
ئـــەوەڵ قـــارِعی دەرگـــای جـــەننەتە
قــابض بــۆ رۆحــی وەختێ نـازڵ بـوو
وە بـــێ إِسْــتِأْذَان داخــل مــاڵ نــەبوو
بــــۆ لای ئـــەنبیا بــاقی کــە چــووگە
مــوحتاج وە ئــیذنی هــیچکام نــەبووگە
جــبریل لە بــیعثەت تــا حــینی وەفـات
بیس و چـوار هـەزار دەفـعە وەلای هـات
لە روژی ئـــەزەل واضـــح بــەر مــەلا
بـەر لە گشت کـەسێ ئەو فـەرمووی بـەلا
عـــیللەی غـــائییەی ئـیجادی عـالەم
بـــاعثی خـــیلقەت طـــینەتی ئـادەم

جَـــلِيلُ المَـــقَام، رَفـــيعِ الهِـــمَم
سَـــيّدُ الكَـــونَيْن شـــفيعُ الأُمَـــمْ
پـــیراســتەی تـــیمثال خـــیصالی کــەمال
ئـــاراســـتەی جـــەماڵ ئـەوصافی جـەلال
پـــێشەوای رەهـــەبەر تـەواو جـوزئو کـول
مـــوقتدای طـــەریق ئـــەنبیا و و روســـول
ســـــەجعی قـــــافیەی نـــەظمی ئـــەنبیا
بـــیت القـــصیدەی بـــەزمی ئـــە صـــفیا
دوڕی یــــــەک دانــــەی بـــەحری نـــبوّت
مـــــەنبەعی ئـــیجرای نـــەهری فـــتوەت
مـــــەخزەنی عـــــیرفان عـــلومی لەدون
مـــەقصدی عـــینوان ئـــەمری لەفـظی کُـنْ
هـــومای هـــەوای ئـەوج قـوربەتی ئـیعزاز
شـــەهبازی ئـــەشهەب لا مَکـــان پـــەرواز
عـــــــەدنانی سِـــــجلّ ســـیّد الأشراف
چـــــرای خــــــانەدان هـــاشم و مـــەناف
شـــاهی مـــەمالک مـــەشرێق و مـــەغرێب
مـــــاهی قـــبایل بـــــەطحا و یـــەثرێب
صـــاحبی لیـــوای صـــەحرای مـــەحشەرە
قـــــاسمی ئـــیعطای حـــەوضی کـــەوثرە
ئـــــەوەل کــــەسێکە لە رۆژی مـــەحشەر
لە رەوضـــەی شـــەریف ســـەر تـــێرێ وە دەر
لە بـــوێ تـــێ خـــەلعەت لە جـانبی حـەق
تــــاج و بـــــوراق و حُـــلّەی إِسْـــتَبْرَق

بـە سـواری بـوراق تـاجی نـوور لە فـەرق
دیت تـەشریف دەبـا بـۆ حـوضوری حـەق
بـــەر حـــەسبی وەعـدەی «مـقاماً محمود»
«خَـــرَّ سَـــاجداً» دەچـــی بـــۆ ســـوجود
دســـــنوێژی غــوسلی عــاڵەمی وەفــات
بــاقیە هـەر بـەو سـوجدەی حـق دەبـات
ئـــەم فـەضلە سـەیرکە لە نـاو بـاقی گشت
دەســـنوێژی دونـــیا بـــوەی بـۆ بـەهەشت
ئـــەم حـــاڵە کـــەی حـاڵ ئـەهلی مـەماتە
مـــەعلووم بـــوو حـەزرەت دارای حـەیاتە
صـــەفای رۆحـــانی و بـــەقای جــیسمانی
تـــەواو مـــوستەکـمیل حِسِّـــی ئـــینسانی
دڵ لە شـــــوهود و ســـــەروە ســـوجدەوە
چاو لە رێ رەحـمەت گـۆش وە مـوژدەوی
«اِرْفَـــعْ رَأْسَک اِشْـــفع» دەشـــــنەوێ
سـەر بـەرز، وە مـوژدەی شـەفاعەت دەوێ
لە مەطلەعی نوور سەر چاوگەی رەحـمەت
وەکو خـۆر هـەڵ تـێ جـەماڵی حـەزرەت
دەخـــرامـێ وە سـەر عـەرشی ئـەکـبەر دا
نـوور ئـەفشان دەکـا وە رووی مـەحشەردا
لیـــوایـــی حـــەمدی بـــۆ بـــەرپا دەوێ
عـــەرضی مـــا بـــەینی ئـــاسمان و زەوی
دەکـــا شـــەفاعەت خـــەلایق یـــەکســـەر
نـــەجاتی تـەوقیف لە صـەحرای مـەحشەر

وایـــە لە صـــاحب رەوضـــە ریـــوایـــەت
حـــەزرەت پـەنج دەفـعە دەكـا شـەفاعەت
شـــەیخی قـــورطوبی عَـــلَیْهِ رەحـــمەت
دەكـــا وە یـــازدە شـــەفاعەت حـــەزرەت
ئـــەو بـە پـێغەمبەر وەخـتێ مـەشهور بـوو
ئەرواح لە كـیسوەت جـیسمانی دوور بـوو
خـــیلعەتی «كُـــنْتُ نَـــبِیّاً» كـــریا
ئـــیعلامی بـــالفعل نـــبوەت دریـــا
هـــاتفی غـــەیبی صـــەدای مـــوژدەی دا
بـە كـــووچە و بـــازار شـــاری عـــەدەمدا
بـــاقی پـــەیەمبەر، پـــێغەمبەر نـــەبوون
تـــاوە كـــیسوەتی جـــیسمانی نـــەچوون
بـە هـــاتنی ئـــەو لە ســـەر مـەوجوودات
ئـــیرسالی رەســـول وە ئـــینتها هـــات
یـــەك یـــەك كـــەهاتن گشت پـێغەمبەران
هـــەر یـەك رەوانـەی یـەك طـایفە كـران
حەزرەتی رەسوول وەخـتێ كـە ئـەو هـات
مـــەبعووث بـــوو لە ســـەر تـەواو كـاینات
شـــەرعی ئـــەو نـــاسیخ شـــەرعی ئـــەنبیا
شـــەرعی خـــۆی بـــاقی تـــا ئـاخر دونـیا
حـــەزرەتی عـــیسی وەخـــتێ بـێتە خـوار
ئـەویچ هـەر وە شـەرع ئـەو دەكـا رەفـتار
لە رۆژی مـــەحشەر دیـــوانـــی ئـــەكـــبەر
گشت حـــاضر دەكـــەن ئـــەنبیا یـەكسـەر

لە گشـــتیان بـــغەیر رەســـوولی عـــەرەب
شـــاهیدی تـــەبلیغ حـــەق دەکـا طـەلەب
ئـــوممەتی حـــەزرەت عـــادڵ و زاهــد
لە بـــۆ ئـــەنبیا دەبـــن وە شـــاهد
تــەصدیقیان دەکـــا حـــەزرەتی رەسـوول
ئــەدای شــەهادەت حــەق دەیکـا قـبول
بـــە وەزنـــی عـەرش و لەوح و هـەم قـەڵەم
صەڵـوات بێ لە سـەر رەسـوولی ئـەکـەرەم

**(جێگای خوێندنەوەی قەصیدە و موناجات)**

**«نەسەبی پێغەمبەرﷺ»**

طـــەریقی ئـــیمام فـــخر الدیـــن رازی
هـــەم جـــەمعێ ئـیمام حـــەق لەوان رازی
مـــتّفق لە ســـەر ئـــەنسابی خـــاتەم
مـــوجِّـد بـــووگن تـــا حـــەزرەت ئـادەم
ئـــەصل و نـــەسەبی کـــافر نـــەبووگن
وە پـــاک هـــاتگن هـــەم وە پـــاک چـووگن
هـــاتگە ئـــەو نـــوورە بـــێ شک و لاڕەیب
لە ئــەصلا بـــی پـاک ئـەرحـامی بێ عـەیب
مـــەخصووص وَالِـــدَیْن بـــەم ســێ دەلیــلە
ئـــەهلی نـــەجاتن لەم قـــال و قـــیلە
ئـــەوەڵ لە وەخـــتی بـــیعثەتا نـــەبوون
دووەم لە ســـەر دیـــن خـــەلیل ثـــابت بـوون

سـێهەم خـوداوەنـد زینـدوویانی کـرد
وە دیـنی ئـیسلام ئـیمانیان هـاورد
بـا وجـود زەمـانی فـیترەتیج بـووگە
هـیچ تـەکـلیفاتێ بـۆیان نـەبووگە
نـەسەب لە عـوقبا قـەطعی گشت دەوێ
اِلاّ سـولالەی نـەسەب ئـەو نـەوێ
ئـوممی و عـەللامە صـاحێبی حـەسەب
لە نـەسڵی عـەرەب قـورەیشی نـەسەب
هـاشمی، مـطلب، مـەدەنی، مـەککـی
نـاوی مـحمّد، عـبدالله بـاوکی
عـبدالله ابـن عـبدالمـطلب
لە طـایفەی عـەرەب مـەشهوور وە غـالیب
دایکـی ئـامینە کـەنیشکی وەهـەب
کـوڕ عـبدالمـناف ئـەوانـیج عـەرەب
ئـەصڵ خـیلقەتی پـێغەمبەر نـوور بـوو
بـۆیە لە سـایە ذاتـی ئـەو دوور بـوو
فـەرد و مـوممتازی جـوملەی کـاینات
نـەجیبتر لە گشت تـەواو مـەوجوودات
قـامەت خـۆش ئـەندام شـیرین هـەیکەل بـوو
لە سـەر تـاوە پـا، لە نـور تـێکەڵ بـوو
دەسـتی وە پـاوە دەگـەیی تـا ئـەژنۆ
بـالاّ مـوعتەدیل پـوڕ عـەطر و خـۆش بـۆ
واسِـعُ الجَـبینْ گـۆشاد پـیشانی
مـنقّش بـە مـوهر نـبۆت شـانی

جەماڵ پوڕ لە نوور، رەنگ چەرمگ و سوور
وەک ماهی کامڵ درەخشان لە دوور
لێو باریک دەندان کەمتەرێ ئەفشان
بەینی هەر دەندان لە نوور درەخشان
لە بەر فەصاحەت حوققەی دەم وسیع
بینی خۆش تەرکیب ئەندەکێ رەفیع
ئەبرۆی مُقَوّس کەمێ پەیوەس بوو
حەڵقەی چاو بڵاو پوڕ کەیف و مەس بوو
اَبْیَضُ الْوَجْهُ وَ اَسْوَدُ الْعَیْنَیْن
عەقیق لەب و اَسْهَلُ الْخَدَّیْن
لە چەرمگی چاو خەتی سوور عەیان
وەک جامی جیهان‌نما، نمایان
بۆ قووەی ئیدراک بینایی بەصەر
تەفاوت نەبوو پەس و پێشی سەر
وە شەو وەکو رۆژ دەی بینی و دە بگرد
وە رۆژ هەم دەرکی ستارەی دەکرد
قووەی سامیعەی وەها دەفەرمو
گاهێ بۆ وەحی مونتەظیر دەبوو
لە سیدرە صەدای پەڕی جوبرەئیل
واضیح دەی شنەفت بە ئەمری جەلیل
سەری گەورە و گرد لامل وەک بلوور
گیسوی بوو چوار هەر وەک گیسوی حور
ریشی تەواو رەش بوڕراق و پڕ بوو
مووی چەرمگ لەوا لە بیس کەمتر بوو

سای گەردەن بوڵەند هەر وەک نوقرەی خام
سینه صاف بێ مو وەک ئاییینەی جام
بەلاَم یەک خەطێ نازک پڕ شەفاف
کێشیا بوو له موو تا بە حەلقەی ناف
له ئاخری سینێ ئەعضا و ئەعصاب
دروشت، موحکەمتر له عالَەم شەباب
دەڕۆی تەشریفی وەهەر گوزەردا
پەخشان بۆی عەطری بە دەشت و دەردا
تاسێ رۆژ هەر کەس لەو ڕێگە دە بگرد
شاممەی بۆی نەسیم حەزرەتی دەکرد
بۆ خولقی لە نێو کەلامی قەدیم
بخوێنە ئایەی «خُلُقٍ عَظِيم»
حەزرەت عایشە وا دەکا بەیان
«كَانَ النَّبِيُّ خُلُقُهُ الْقُرآن»
عەقلی بە میزان بیکەی بەرابەر
راجعتر لە گشت عوقلای بەشەر
ئوممی و نەخوندە عەللامەی زەمان
جَامِعُ الْكَلاَمِ أَفْصَحُ الْبَيَان
حیکمەتی قانوون دەستووراتی ئەو
کافیە لە بۆ موعجیزاتی ئەو
هەزار و سێصەد شەصت و چوار ساڵ
تا حاڵ نەی بووگە یەک نوکتە ئیخلاڵ
پەروەردەی تەئدیب ذاتی خودا بوو
موئەددەبترین گشت ئەنبیا بوو

تـــــەشریفی وارد وە مـــــەجلیس دەبـــــوو
جـێگەی دانـــیشتن بـــۆی مـــەعلووم نـەبوو
هـــەر جـــێ خـــاڵی بـــوو لە وێ دادەنـــیشت
ئـــــەغڵەب دادەنـــــیشت لە پـــاییني گشت
نـــــەبوو جـــولوسی خـــارج بـــێ لە حـــەد
یـــا پـــای لە مـــەجلیس ئـــەصحاب بکـا رەد
وە بـــــێ ئـــــیحتیاج قـــەت نـــەبوو گـــۆیا
مـــــــەر وەخـــــتی لوزوم لازم بـــــوایـــــا
فـــەرمایش مـــەلیح ئـــەدای خـــۆش نـەفەس
پـــڕ مـەعنا واضـیح حـاڵی بـوو گشت کـەس
قَـــــلیلُ الضَّـــحْکُ کَـــثِیر الأفکـــار
دڵ دایــــم وە یـــاد وەحـــــی ئـــینتظار
کـــــەنین وە قَـــهْقَه هـــەرگیز نـــەی بـــووگە
بـــەلاّم وەک غـــونچە خـــەندەی فـــەرمووگە
ســـــەلامی لە ســـــەر گشت کـــــەسێ دەدا
کـــــەبیر و صـــــەغیر غـــــەنی یـــا گـــەدا
بـــۆ دەعـــوەت ئـــەصحاب تـــەشریفی دەبـرد
مـــــوصافەحەی هـــــەم لە گـــەڵیان دەکـــرد
تـــەشریفی دەڕۆی لە پشت ســـەر ئـــەصحاب
دەخـــرامـــی هـــەروەک مـاهی جـیهان تـاب
دەی فـەرموو: ئـەصحاب گشت بـڕۆن لە بـەر
خـــاڵی کـــەن لە بـــۆ مـــەلەک پـوشتی سـەر
ئـــــەفکەندە نـــــەظەر مـــــەردانـــە قـــەدەم
زەوی لە ژێـــــر پـــــای دەپـــێچیا، وە هـــەم

لە گـەڵ قـەد بـوڵەند ئـەر وەرێ دەچـوو
بـاڵای لە سـەر ئـەو بـوڵەندتر دەبـوو
مـیهامانی دەهـات ئـەو بـە خـۆشحاڵی
جێگەی خـۆی ئـەغلەب بـۆی دەکـرد خـاڵی
جـەبین مـوشەعشەع روخسـار تـابندە
خـورشید لە خـجلەت ڕۆی سـەر ئـەفکەندە
هـەڵهات سـەرگەردان تـا بـانگی شـێوان
یە خەی چاک وەک شێت ڕووی کرد وە کێوان
نـەبوایـا ئـەگـر مـوعجیزەی وەهـا
بـەس بـوو جـەماڵی پـێغەمبەر خـودا
ذاتـی ئـەو لە گشت عـالەم سـیوا بـوو
مـەر هـەر لە خـەلقا خـەلقی خـودا بـوو
ئـینکاری ئـیعجاز ئـەمری نـبوّت
یـا خـۆ ئیستیخفاف نیسبەت وە حـەزرەت
یـا هـەر چـی لایـق شـانی ئـەو نـەوێ
نـیسبەتدا هـەر کـەس بـێ کـافر دوێ
ظـاهیر و بـاطین مـوبەڕا لە عـەیب
مـەحرەمی ئـەسرار پشـتی پـەردەی غـەیب
ئـەشەرەف و ئـەفضەل ئـەنبیا و رەسـووڵ
شـافیعی مـەحشەر شـەفاعەت قـەبووڵ
زومـرەی ئـەصحابی مـوعتەبەر بـووگن
مـەنظووری نـەظەر پـێغەمبەر بـووگن
دەرحـەقیان دەخـیل بـێ ئـیخلاص نـەبین
گشت دارای شـەرەف صـوحبەتی نـەبین

هـــــــه‌ر واقــــيعاتێ له بـــــه‌يينا بگـــــرد
مه‌قصوود هه‌ر دين بوو هه‌ر چێكيان كـه كـرد
گشت وه شـــه‌هاده‌ت له دونـــيا ده‌ر چـــوون
قــاتڵ و مــه‌قتوڵ داخــڵ بــه‌هه‌شت بـــوون
له تـــــه‌حتى ســـه‌را تــا فــه‌وقى ئـه‌فلاک
صـــه‌ڵوات بــێ له ســه‌ر صــاحبى له‌ولاک

**(جێگای خۆيندنه‌وه‌ی قه‌صيده و موناجات)**

**«باسی دروست كردنی حه‌زره‌تی ئاده‌م عليه السلام»**

دوای مــــــودده‌تێ خـــــه‌للاقی عـــــالـه‌م
مــه‌يلی كــرد وه خـه‌لق حـه‌زره‌تی ئـاده‌م
بــۆ خـــاطر ظـوهور ره‌سـوولی سـه‌روه‌ر
خـــيلقت كـــا وجـــود ئـــاده‌م بُـــوالبَشَــر
جـــــبريل تـــه‌شريفی له بـــۆ زه‌وی بـــرد
مــيقدارێ خـــاكـی فــه‌وری حــاضر كـرد
بــردی بـــا كـــه‌ماڵ حـــوسنی له طـــايف
جــه‌معی دا له بـــه‌ين مـــه‌ككـــه و طـايف
خاكێ بـوو ئـه‌لوان تـێكه‌ڵ له چـه‌ند جـۆر
زه‌رد و ســياه و چـه‌رمگ له گـه‌ڵ سـوور
وه ئـــاوی شـوور و تـه‌ڵخ و هـه‌م شـيرين
كـــــردی وه خـــــه‌مير جــبريلی ئـــه‌مين
بـــــۆيه وا ره‌نگ و طـــــه‌بيعه‌ت بـــه‌شه‌ر
نــيه وه يـــه‌ک جــۆر تـه‌واوی يـه‌كسـه‌ر

لەو دوا ئـەمری کـرد خـالیقی ئـەکبەر
بـۆ تـەمهیدی نـوور سـەییدی سـەروەر
لەو جـێگە رەوضـەی صـاحیب لەولاکـە
بـردی یـەک قـەدرێ لەو خـاکـە پـاکـە
وە مشک وکـافور لە گـەڵ زەعـفەران
سـمڵ و مـیخەک لە گـەڵ زومـیران
کـردی وە تـێکەڵ ئـەو خـاکـە تـەخمیر
بـە ئـاوی تـەسنیم هـم مـاءُ المـنیر
سـاختە بـوو لە طـیف تـەواو شـەرفناک
شـوعلەوەر هـەر وەک دوڕی تـابناک
گـەڕانـدی تـواو زەمـین و فـەلەک
ئـەرض و سـەماوات مـاهی تـا مـەلەک
بـزانـن هـەرتا گشت خـەلق، عـاڵەم
قـەدر و مـەنزیلەت رەسـوولی خـاتەم
لەو دوا ئـەمری کـرد خـوداوەنـد دەردەم
کـریا وە تـێکەڵ خـەمیری ئـادەم
هـەر وەقت کـە حـەزرەت سرشتی بـوێ
خـەلقی لە عـەینی ئـەو نـوورە دەوێ
لە رۆژی جـومعە مـەقروون بـە زەوال
ئـادەم خـیلقەت بـوو تـەواو و کـەماڵ
ئـەویان وە ئـیکرام لە بـۆ بـەهەشت بـرد
تـەختی نـوورینیان لە بـۆی نـەصب کـرد
لیـباسی مـومتاز بـەهەشتی لە بـەر
تـاجی مُـرَصَّع کـەرامـەت لە سـەر

نـووری خـیلقەتی رەسـوولی سـەروەر
نـەقل بـوو وە صـولب ئادەم بُوالْبَشَر
حـەزرەتی ئـادەم وا کـە مـەشهووره
دەی شنەفت تەکبیر صەدای ئەو نووره
لەو دوا لە ئـادەم نـەقلی کـرد وە شـیث
لە شیث هەم رۆیی تا گەیی وە ئیدریس
لە ئیدریس هەم هات بە ئەمری مەننان
پشت وە پشت هەرتا حەزرتی عەدنان
لە عـەدنان بگـرد نـووری ئەو حەبیب
تـا لای عـبدالله وە نـەظم و تـەرتیب
لە پـێشانی پـاک عـبداللهِ گـوزین
شـوعلەنما بـوو وەک دورِی ثـەمین
عـبدالله مـەحبوب شـیرین جـەماڵ بـوو
صاحب فەهم و هۆش، عەقل و کەماڵ بـوو
عـبدالمـطلب کـردی ئـارەزوو
لە بـۆ عـبدالله ژنـی بـێرێ زوو
جـۆیا بـوون گەڕیان لە خـێڵی عـەرەب
کـەس نـەبوو مـەگـەر ئـامینەی وەهـەب
وە ئـادابـی خـاص شـیرین تـەدارەک
کـریا عـەروسی چ پـڕ مـوبارەک
ئەو وەخت تا ئادەم لە بـەهەشت دەرچـوو
شەش هەزار لەگەڵ چل و سێ سـاڵ بـوو
عـوروجی حـەزرەت عـیسا بـۆ سـەما
هـەشت سـاڵ و لەگـەڵ پـانصەد و حـەفتا

دەورەی عـــەداڵـــەت نـــەوشیرەوان بـــوو
وەقعەی عـام الفـیل هـەر ئـەو زەمـان بـوو
وەخـــتێ بـــوو لە مـــاه جِمادِی الأُخْـریٰ
عــــەمل بــە ئــەییام تــەشریق دەکــریا
هــــەر لەو مــــانگەدا ئــەییامی تــەشریق
شـــەوی دووشـــەممە گــەیگە وە تـەحقیق
ئـەوەڵ شـەو زوفـاف نـوطفەی ئـەحمەدی
عەقدی بەست وە لوطف عەطای سەرمەدی
صــەفادەن هـــەر دەم مـەجلیسی مـەولوود
وە ذیکــــری صـــەڵوات حـەبیبی مـەعبوود
(جێگای خوێندنەوی قەصیدە و موناجات)

«باسی لە دایک بوونی پێغەمبەرﷺ»

خـــودا ئـــەمری کـرد ریـضوانـی بـەهەشت
گوشاد کـا درگـای بـەهەشتی هـەر هـەشت
هـــەم فـەرمووی مـالێک درگـای جـەهەننەم
واز نـــەکـــا ئــیمشەو بــیوەسی مـــەحکەم
بــارانــی رەحـــمەت هــەورەکــەی باری
دا رژیـــا وە تـــا و بـــاری چـــۆن بـــاری
دایـــماڵی خـــاشاک قــەحطی و گــرانـــی
رووی دا بـۆ مـەخلوق خـۆشی و هـەرزانـی
ئـــەنواعـــی نــیعمەت ئـەوەند ووفـوور بـوو
ئــەو ســـاڵە وە ســاڵ فـەتح مـەشهوور بـوو

نــــيشانه و ئـــــاثار نــــبوەت حـــەزرەت
بـــــەر له تـــــولّد تـــــا حـــينى بـــيعثەت
خـــــەيلێ زيـــــاده بــــــەيان نــــاكــرێ
بـــــــاعيثى طـــــووله نـــــاوى نـــــابرى
حـــــەزرەتى عـــەبباس مـــاموى پـــێغەمبەر
له مــــــــنالّى حــــــەزرەت وادەدا خـــــــەبەر
فەرمووى يـەک ئـەمرێ عـەجايێب لەو ديـم
بـــــاعيث بـــــوو ئـــاخر له بــــۆ ئــيسلاميم
مــــــندالّ بـــوو شـــەوێ ئـــەو له گـــەهواره
دەســــــتى له بـــــۆ مـــاه دەكــرد ئــيشاره
وه هــــــەر لاێــيكا ئـــەو دەســتى دەبــرد
مــــــەهتاب گـــــــەردشى له گـــەلّيا دەكــرد
مـــــن وه قـــــــەرينه وەهـــا دەركــم كــرد
له بـــــەينا قســــــەو بــاسيان هـــەم بگـــرد
له دلّـــما هـــەر مـــا ئـــەو ئـــەمره مەستوور
تــــا وەختێ بيعثەت ئـەو كـردى ظـوهوور
دواى بــــــــــيعثەتى مــــــوددەتێ بگـــــرد
ســـــــوئالى ســــــەبەب واقـــێعەم لێ كــرد
فەرمووى يـا عـەبباس له رووى صـەداقـەت
لەو وەخــــــتا نــــــەبووم ئــارام و طــاقەت
دايـــــــــــــانم نـــــــــەبوو ئـــــەوساته لەلام
بـــــۆ خـــــاطر ئـــەمه مـــن بگـــرم ئـــارام
لەگـــەلّ يـــەكـــترين گـــفتوو گـــۆمان بـــوو
قســـه و حـــيكايەت بــەينى خـــۆمان بـــوو

هەروەخت لە پای عەرش کە سوجدەی دەبرد
مــن ســەماع صــەدای تــەقدیسم دەکــرد
بــە فــەرموودەی ئـەو مـن تـەصدیقم کـرد
ئــیمانم وە دڵ مـــن بــە ئــەو هــاورد
بـــووبەکــر صــدیق دەکــا ریــوایــەت
بــۆوەختی ظــوهوور بــیعثەتی حــەزرەت
بــۆم هــات صـەدایێ لە رووی یـەک درەخت
ابـــن قــحافە زوو بـــرۆ وە جــەخت
لە ســـەر مُـــحمّد وەحــی نــازڵ بــوو
کـــەس نـــیە بــوێ ســەبقەتی لە تــۆ
هــاتم وە تــەعجیل مـن بـۆ حـوضوری
ئــیمانم هــــاورد دەر لەحـــظە فــەوری
لە ابـــن نَـــوْفَل نـــەقل دە فــــەرموو
ئێژی هـەر ئـەو شـەو حـەزرەت پـەیدا بـوو
لە یــەک بت مــضمون دوو بـەیتم شنەوت
تــاخوندی فـەوری وە رووی زەوی کـەوت
ووتـــیها رەســوول هــاتە رووی دونــیا
قـــووەی ســـەڵطەنەت لە شــاهان ســنیا
تـــاریکی و ظــوڵمەت کــوفر فــەنا بــوو
تــا روخســارەی ئــەو شــوعلەنما بــوو
بـــاز هـــەم جــەهێنی ئـێژی لە روئـیا
دیــم لەبــان کــەعبە نــووریٚ شـوعلەی دا
هـات یـەک صـەدایێ لەو نـوورە وە گـۆش
خوندی چەند بەتێ شیرین عـەجەب خـۆش

ساطع بوو ئەنوار لا بریا ظولمات
ظاهر بوو بیعثەت فەخری کائینات
مەحکەم بوو ئیسلام مونشەق بوو ئەصنام
جاری بوو ئەحکام بۆ صیلەی ئەرحام
عبدالمطلب وەها دەفەرموو
ئەو شەو کە حەزرەت تەوَلّدی بوو
ئیتفاق وابوو من لە ماڵ نەبووم
مەشغول وە طەواف ماڵی کەعبە بووم
دیم کەعبە ناگاە راست بوو وە سەر خۆی
لە عیشق پادشای لاَیَمُوتِ حَیّ
سوجدەی برد ووتی الله اکبر
خەلاص بووم لە دەس بتخانەی کەفەر
صەدایە وە هەوڵ لە رووی هەوا هات
ئەوا پەیدا بوو زو بدەی مەوجوودات
بتانی کەعبە صەدایان شنەوت
گشتی سەرازیر وە رووی زەوی کەوت
یەک جەماعەتێ لە ئەهلی قورەیش
ساڵی یەک دەفعە جەم دەبوون وە عەیش
دەچوون لە یەک بت سوجدەیان دەبرد
حەمد و تەعظیم و ثەنایان دەکرد
تا شەوێ رۆیین وە عادەت خۆیان
بۆلای ئەو بتە گشت ثەنا گۆیان
دیان سەرازیر بووگە بەرەو خوار
راسیان کردەوە هەروەک ئەوڵ جار

بــاز هــەم بــەرەو خــوار سـەری بردەوە
بـــاز هـــەم دووبـــارە راســیان کــردەوە
نــەصبی مــحاڵ بــوو دەســیان لێ بــەردا
نــاڵەی کــرد شکــیا بــەر بــوو لە سـەردا
دوای مــــوددەتێ لێـــیان حــــاڵی بـــوو
ئەو شەو شـەوێ بـوو حـەزرەت پـەیدا بـوو
بت لە بــــتخانە ســــەرنگون ئــەو شــەو
کــاهێنان لە کــار گشت زەبــوون ئـەوشەو
ئــیوانــی کــیسرا دووفـەرق بـوو ئـەوشەو
ئاگـری زەردەشت بـێ بـەرق بـوو ئـەوشەو
سەرد بوو وەک یەخبەند، بێ تاو بوو ئەوشەو
بەحری ساوە وشک بـێ ئـاو بـوو ئـەوشەو
ســـەرنگون ئــەوشەو تــەختی ســەلاطین
هــەم مــەنعی عــروج زومـرەی شـەیاطین
درگــای ئــاسمان گشت واز بــوو ئـەوشەو
مــەلایک لە عـەرش پـەرواز بـوو ئـەوشەو
تـــەقدیری ئـــەزەل قـــەضا و قـــەدەر
حـــەزرەت عـــبداللە چـــووبوو ســـەفەر
تـــەشریفی بـــۆ شـــام و تـــیجارەت بـــرد
هـــات بـــۆمەدینە لە وێ فـــەوتی کـــرد
مـــــەلایکان گشت هــــاتن وەزاری
عــەرضیان کــرد وە زات ئــەقدەسی بـاری
حـــەبیبت، یــەتیم مــاوە وە بــێ کــەس
فــەریاد رەس خــۆتی فــەردی فــەریاد رەس

خـــــوداونـــد فـــەرمووی ئـــەی مـــلایکان
مـــن خـــۆم کـــەسێکم بـــە ئـەمن و ئـەمان
خـــــاصتر لە گشت کــــــەس پـــەرستارترم
لە بـــــاوک و دایکــــــی رەحـــــمدار تـــرم
خـــۆم خـــاص دەزانـــم بـــیکەم پـەروەرش
تـــــەعلیم و ئـــــاداب، رەفـــــتار و رەوش
خـــــەبەر وەفـــــاتی هـــــات لە مـــــەدینە
بـەرز بـوو صـەدای شـین حـەزرەت ئـامینە
عـــــبدالمـــــطلب دەی کــــرد دڵـــداری
دەیـــــــدا تـــــەسەللی لە گـــــریە و زاری
لەم مــــــوصیبەتە ئـــــەربوێ صــــەبرت
بـــە فـــەضل و کـــەرەم حـــق دەدا ئـەجرت
پـــەیا پـــەی صـــەڵوات دەمـــا دەم ســـەلام
وە رەوضـــــەی رەســــــوول ســــیّدالانــــام

**(جێگای خۆیندنەوەی قەصیدە و موناجات)**

وایـــــە إتّــــفاق ئـــەربابی حـــیکمەت
بـــۆ فـــەضلی طـلوع جـەماڵی حـەزرەت
رێـــژانـــی رەحـــمەت فـــەصلێ لە بـــهار
خـــوداوەنـد کـردی ئـەم لوطـفە ئـیظهار
بـــــلبڵ لە مـــینبەر دووشـــاخەی رەفـــیع
خـــوتبەی خـوند وە نـاو پـادشای رەبـیع
خـــورشید وە لەنـجە و نـەزاکـەت و نـاز
لە بـــورجـــی حـــەمەل بـــاڵی دا پـەرواز

ئەو گوڵ دەستەی دەست شاهیدی ئەسرار
ئـەو جـیلوە جـەلای روخسـارەی بـهار
لە مـەطلەعی غـەیب عـالەمی ئەرواح
طـالع بـوو لە بـۆ بـازاری ئـەشباح
طەی کرد ئەصلاب و ئەرحامی طـوهوور
لە عالەمی غەیب بۆ عـەرصەی ظـوهوور
لە صـەحنی حـەرەم مەککـەی مُعَظَّمْ
جـیلوەنما بـوو لە پـەردەی رەحـەم
پـەروازی مـەلەک نـەشیب و فـەراز
ئـاوازەی طـەیران لەحـنی خـۆش ئـاواز
شـادی و بـەشارەت بـالاّ و پـەستی
غـولو کـەوتە نـاو عـالەمی هـەستی
پـەیکی بـە شـارەت بِـرُسُلِ الرِّیـاح
ئـاثاری ئـەسرار فـالِقُ الأصْـباح
بـۆ فـەجری صـادق صـوبحی بهاری
هـێنای بـەشارەت رەحـمەتی بـاری
مـەحضی تـەشریفات نـەسیمی ئـاثار
جـەلایدا جـەماڵ گـوڵباغچەی بـهار
نـەورەس غـونچەکـان ئـەطفاڵی رەضـیع
شاد بوون وە پـوستان مـورضیعەی رەبـیع
عـەطرالوی شـەوبۆ هـەوای صـوبحدەم
نەسیم وەک نـەفەس عـیسای بـن مـەریم
گوڵشەن خۆش نەسیم هەوا دڵکـەش بـوو
وەختی مەی نۆشان بادەی بێ غەش بـوو

لاله پــــیاڵه بـــڵبڵ نـــــەغمه خـــان
نەیچی‌وه پـەنجەی خـیضاب ئـەر غـەوان
ساقی مەی گـوڵنار بـادەی جـام وه کـەف
بــێرا وه مـــەجلیس صـەفادەن وه صـەف
وەخـــتی نــۆشانۆش بـادەی ئـەحمەرەن
عـــەیدی مـــیلادی ســاقی کـــەوثەرەن
صــــەفای گـــولاڵەی روخســـارەی بـهار
رەنگا رەنگ، ئـەلوان صـەفحەی رۆزگـار
قـــەدیم یـــا جـــەدید کـــۆنه یـــا نــەوه
گشــــتی له پــــــرتەو جـــەماڵی ئــەوه
صـــەلات و سـەلام بـێ حـەد و ئـەنجام
وه رەوضـــەی رەســوول خـاتیمەی کـەلام

(جێگای خوێندنەوی قەصیده و موناجات)

حـــەزرەت ئـــامینه دەکـــا ریـــوایـەت
ئـــەو له کـــەیفیەت حـــەمل ووەلادەت
ئـــێژێ لەو حـەمله مـن رەنـج و ئـەلەم
نـــەم‌بوو وەک ســـایر ژنـــانی عـــالەم
فەقەت هەر ئەونده له خۆم دەرکـم کـرد
رەویـــەی عـــادەتم له وەخـــتی بگــرد
هەر خۆم ئاگـا بـووم له سـەر ئـەسرارم
بێ خـەبەر له مـن گشت کـەس و کـارم
بـــەڵام هـــەر مـــانگێ یـەک له ئـەنبیا
دەهـات وەلای مـن مـوژدەی پـێم دەدا

حــەملی تــۆ حــەبیب حــەیی داوەرە
مــمتازی عــالەم فــەخری بــەشەرە
ســەییدی ئــەولاد حــەزرەت ئادەمە
بــاعیثی ئــیجاد خــەلقی عــالەمە
تا شەوێ تەنها لە حوجرەی خـۆم بـووم
هاتە یەک صەدایێ لە حالێ خۆم چووم
ئیشی وەضعی حەمل بـۆمن پـەیدا بـوو
ماڵ تـاریک تـەنها کـەس لە لام نـەبوو
جامێ پـڕ شـەربەت صـافی بـێ نـەظیر
شـیرین‌تر لە قـەند سـفیدتر لە شـیر
دەرحـال حـاضر بـوو وە منیان نـۆشی
دای پێم مەزەی نۆش شـیفای نـاخۆشی
دای لە رووی دەماغ عەطر بۆی گوڵشەن
دنـیا بـەرقی دا عـالم بـوو رۆشـەن
لە رووما پـەردەی ظـوڵمەت لابـریا
دیم وە چـاو ظـاهر قـوصووری بـوصرا
فـەوری چـوار ژن حـاضر بـوون لە لام
نەجیب و بوزرگ صاحب عـەقل و فـام
جــەم بــوون لە دەورم وە مـیهرەبانی
بە شادی و صـوحبەت شیرین زوبـانی
یەکی حـەووا بـوو هـاو جـوفتی ئـادەم
یەکێ دامـەن پـاک، حـەزرەتی مـەریەم
یــەکێ سـارا بـوو جـوفتی ئـیبراهـیم
یــەکێ ئـاسیە بـینتی مـوزاحـیم

بــۆ خــۆش گــوزشتن لە حــاڵەتی مــن
دەیــان کــرد هــەر یــەک دەلاّلــەتی مــن
بــەشارەت وە تــۆ ئــامینەی وەهــەب
حەملّت شەخصێکە بەس عالی نــەسەب
حــەبیبی مــەحبوب ذاتــی ســوبحانە
ئــەشەرەفی عــالەم کــەون و مــەکانە
شــــەوی دوازدەی رَبِــــیع الْــمَوْلُود
دووشەممەی شەریف موبارەک مەسعوود
بـو فـەجری صـادق طـولۆعی سـەحەر
بـەر لە خـۆر کـەوتن لە کـەل بـێتە دەر
دیم طەیرێ زەڕیـن شـیرین پـەڕو بـاڵ
وارد بوو دەرسـات داخـل بـوو وە مـاڵ
وتــیان ئـەم طـەیرە حـەزرەت جـبریلە
دەوێ بــۆ ســەهلی حــەملّت وەسیلە
دای لە رووی سینەم ئەو طـەیرە شـاباڵ
پـەیدا بـوو فـرزەند گـوزیدەم دەر حـاڵ

نَوَّرَ الْفَضا اَکْرَمُ الْوَریٰ مَرْحَباً بِهِ اَلْف مَرْحَباً

اَلصَّلاٰةُ وَ السَّلامُ عَلَیْکَ وَ عَلیٰ آلِکَ وَ اَصْحٰابِکَ وَ أَتْبٰاعِکَ یٰا رَسُولَ الله

اَللّٰهُمَّ اِنّٰا حَضَرْنٰا مَوْلِدَ نَبِیِّکَ فَأَفِضْ عَلَیْنٰا مِنْ بَرَکَتِهِ خَلْعَ التَّکْرِیمِ وَ أَسْکِنّٰا بِجِوارِهِ جَنَّةُ النَّعِیمِ اَللّٰهُمَّ بٰارِکْ وَ تَقَبَّلْ مِنْ بٰانِي هٰذا الْمَوْلُودِ الْمَسْعُودِ وَ أَعْظَمَ أَجْرَ الْحٰاضِرِینَ بِحُرْمَةِ صٰاحِبِ الْمَقٰامِ الْمَحْمُودِ وَ خَصِّصْنٰا بِمَزایٰا الْقَبُولِ، وَ وَفِّقْنٰا عَلیَ الْفُرُوعِ وَ الْأُصُولِ وَ اغْفِرْ لَنٰا ذُنُوبَنٰا وَ بَلِّغْنٰا آمٰالَنٰا وَ احْشُرْنٰا مَعَ الصّٰالِحِینَ وَ الْمُتَّقِینَ أَللّٰهُمَّ رَبَّنٰا تَقَبَّلْ مِنّٰا اِنَّکَ أَنْتَ السَّمِیعُ الْعَلِیمُ وَ تُبْ عَلَیْنٰا یٰا مَوْلاٰنٰا اِنَّکَ أَنْتَ التَّوٰابُ الرَّحِیمُ سُبْحٰانَ رَبِّکَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمّٰا یَصِفُونَ وَ سَلاٰمٌ عَلیَ الْمُرْسَلِینَ وَ الْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِینَ

مەولود نامە

کۆکردنەوە

# ماموستا

# مەلا محمدی شەڵماشی

١٤٢١ک ـ ٢٠٠٠ز

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحيمِ

**الحمدلله ربّ العالمين والصلاة و السلام على سيدنا محمد و على آله و أصحابه و أتباعه أجمعين..**

موسڵمانینه! پێغەمبەر (درووودی خوای لە سەر بێ) هەروەک لە دوای لە دایک بوونی موعجیزەی نواندووە، لە دایک بوونەکەشی هەر بە موعجیزە بووە. بۆ نموونە حەزرەتی عائیشە ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ دەفەرمووێ:

جۆلەکەیەک لە (مەککە) بازەرگانی دەکرد. ئەو شەوەی کە پێغەمبەر لە دایک بوو لە کۆڕ و مەجلیسێکدا روویکردە قوڕەیشیان و گوتی: ئەو شۆ چ ئافرەتێک منداڵی بووە؟ گوتیان: نازانین، جۆلەکەکە گوتی: (الله اکبر) گوێ بگرن و بزانن دەڵێم چی. ئەو شۆ پێغەمبەری ئیسلام لە دایک بووە، بەو نیشانە کە مۆری نبووەتی لە ما بەینی هەر دووک شانیدا بەرزبۆتەوە و کۆمەڵە موویەکی لە سەر رواوە قوڕەیشی‌یەکان ئەو قسەیان زۆر بەلاوە سەیر بوو. هەستان چوونەوە بۆ ماڵ پرسیاریان کرد. گوتیان: بەڵێ: خێزانی عەبدواللەی کوڕی عبدالمطلب کوڕێکی بووە ناویان ناوە (محمد). لە پاشان قوڕەیشیەکان هاتنەوە بۆلای جۆلەکەکە خەبەریان دایە، گوتی: وەرن لە گەڵم با بچین تەماشای بکەین. کاتێ چوون بۆلای حەزرەتی ئامێنە و تەماشایان کرد مۆری نبووەتی بە ناو شانانەوە بوو. جۆلەکە بەلاداهات و بێهۆش کەوت، کاتێ وەهۆش هاتەوە گوتیان: ئەوەبۆ وات بە سەرهات؟ گوتی: ماڵ نەوێرانینە! قەسەم بە خوا تازە لە ناو بەنی ئیسرائیلیاندا هیچ پێغەمبەر پەیدا نابنەوە. ئێوە کەیف خۆش بن بە خوا ئەوەندە و تەرەقی پێدەدا ناو بانگ و مەشریق و مەغریب دادەگرێ.

وە لە زۆر ئایەتی قورئانی پیرۆزدا باسی عەزەمەت و گەورەیی و قەدر و روتبە و مەقامی پێغەمبەر کراوە. بۆ نموونە سوورەی (**إنا أعطيناك الكوثر**) کە بە لەفزی

فیعلی ماضی هاتووە و نەیفەرمووە: (سنُعطیک) مەعنای وایە هەر لە پێش لە دایک بوونیدا خوای گەورە ئەو خەلاّتەی بۆ داناوە. ئەوە وەک ئەوە وایە کە خوای گەورە بفەرمووێ: ئێمە ئەسبابی سەعادەتی تۆمان لە پێش ئەوەدا بێیە بـازاڕی بـوون و وجوودەوە ئامادە کردووە. وە نەبێ بە هۆی بەندەنگی و تاعەتەوە ئەو مەرتەبەمان دابێ بە تۆ. بە تایبەتی گەورەیی پێغەمبەر لە ئایەتی (اِن الله و ملائکتَه یُصلون علی النبی) دا زۆر ئاشکرایە، خوای گەورە دەفـەرمووێ: لە عـالەمی عـولیادا خـوا و مەلائێکە سەڵوات لە سەر پێغەمبەر لێدەدەن، دە ئێوەش ئەی بەرەی ئـادەمیزاد لە عالەمی سوفلادا و لە سەر ئەرز سەڵوات لە دیداری لێبدەن تا لە ئەرز و ئـاسمان سەڵـواتی لە سەر لێ بدرێ، لە ئایەتێکی دیـدا دەفـەرمووێ: (وَ اللهُ یَـشْهِدُ اِنَّکَ لَرَسُولُهُ) خوا شاهیدە تۆ رەسوولی خوای، جا چ لەوە گەورەترە کە خوا شاهیدی بۆ بدا؟ لە ئایەتێکی دیدا خوای گەورە دەفـەرمویّ (لقد منّ الله علی المـؤمنین) خـوا منەت بە سەر موسڵماناندا دەکا کە ئەو پێغەمبەرەی بۆ ناردوون، جـا ئـەی ئـەو کەسانەی کە لەو کۆڕ و مەجلیسەدا دانیشتوون و گوێتان گرتووە! بۆ باسی لە دایک بوون و مەولوودی پێغەمبەر، بزانن کە لە هەموو شتێک گرنگتر لە دواناسینی خوای ئەرز و ئاسمان، ناسینی ئیسم و ناو و ئەخلاق و ئـەوسافی پـێغەمبەری ئـاخری زەمانە. کە گەورەترینی ئەفرادی نەوعی ئینسانە. ناوی موبارەکی محمدە، کـوڕی عبدالله کوڕی عبدالمطلب ی کوڕی هاشمی کـوڕی عـبدالمـنافە، دایکـی نـاوی ئامینەی کچی وەهەبە، زاتی موبارەکی ئەو پێغەمبەرە سەرچاوەی کەماڵ و ئەدەبە، تاوسی جیلوەگای شهوودە. مەقسوودی مەملەکەتی وجوودە. موقەڕەبی بارەگای باری‌یە و مەحبووبی خوای مەعبوودە. خاوەنی مـەقامی مـەحموودە. مـەعدەنی ئیحسان و جوودە. ئەسڵی خڵقەتی نوورە، زاتی موبارەکی نووری عەلا نوورە، لە وەسفی شەمائیلیدا دەڵـین: روخساری ئابداری نـووری رەحـمەت بـوو، چـاوی شەهلای مەقامی نووری عیزەت بوو، و زمانی موعجیز بەیانی جێگای نـووری حیکمەت بوو، مینبەری پێغەمبەر سێ پایە بوو. چووە سەر پایەی یەکەم فەرمووی:

ئامین. لە پایەی دووهەم فەرمووی: ئامین. لە پایەی سێیەم فەرمووی: ئامین. لە پاشان ئەسحاب عەرزیان کرد قوربان! ئەو ئامینانە چی بوون؟ فەرمووی: کە قاچم نایە سەر پایەی یەکەم جوبرەئیل هات گوتی: لەعنەت لەو کەسە بێ کە ناوی تۆی لا ببرێ و سەڵواتت لە سەر لێ نەدا. گوتم: ئامین. لە پلەی دووهەمدا گوتی: لەعنەت لەو کەسە دڵی دایک و باوکی لە خۆی رازی نەکا. گوتم: ئامین. لە پلەی سێیەمدا گوتی: لەعنەت لەو کەسە کە مانگی رەمەزان داهات ئەوەندە خواپەرەستی نەکا کە موستەحەقی مەغفیرەت بێ گوتم: ئامین.

راوی دەڵێ: لە رۆژی قیامەتدا مەلائێکەیێک زۆر بە سام و هەیبەت یەکێک لە ئوممەتی پێغەمبەر دەبا بۆ جەهەننەم. کابرا دەڵێ: ئەی مەلائێکە! ئەوە بۆ کوێم دەبەی؟ دەڵێ بۆ دۆزەخ، ئەو عەبدە فەقیرە دەڵێ: بە حەقی فەریادڕەس لێم گەڕێ با بگریم بۆ خۆمی بێکەس. دەڵێ: دەی، ئەو بەندەیە دەگری و دەست دەکا بە ناڵین و ئەفغان و شین ئەو شیعرانە دەخوێنێتەوە زۆر بە غەمگین.

| | |
|---|---|
| وەکوو باران دەڕێژم ئەشکی چاوم | لە ترسی ئاگری دۆزەخ سووتاوم |
| غەریب و بێکەس و وێرانە ماڵم | وە چاکە دایمە بۆ خۆم بناڵم |
| دەگریی تۆ لە باتی ئاوی چاوی | لە چاوی دێتەدەر خوێنی هەناوی |

مەلائێکە پێی دەڵێ: لە دنیادا ئەو گریانە چابوو، خاوەنی قەدر و بەهابوو. ئێستا ئەو گریانە فائیدەی نییە، خۆت حازرکە بۆ هاویە. ئینجا ئەو عەبدە بێچارە دەڵێ: من هەر چەند بێوجوودم، بەڵام ئوممەتی ساحبی مەقامی مەحموودم، مەلائێکە دەڵێ: کە وایە ئێستا محمّد لە حزوور خوایە، هاواری بکەیە بەلکوو رزگارت بکا لەو بەڵایە، دەڵێ:

یا سەییدەالسادات! رزگارم بکە رۆحم بێ بەفیدات.

جا پێغەمبەر لە بەر ئەوەی ئەو بەندە گوناحکارە سەڵواتی زۆری لە دونیادا لە دیداری محمّد داوە شیفاعەتی بۆ دەکا و رزگاری دەکا. کاتێ بردیانە خزمەت پێغەمبەر خۆی داوێتە سەر قەدەمی موبارەکی پێغەمبەر و خاکی بەر پێی ماچ دەکا

و دەڵێ: یا محمّدی موختارا «لو لا أنتَ و صلواتی علیکَ لَهویتُ فی النار» ئەگەر تۆ و سەڵواتەکانم نەبوایە دەیان خستمە ناو ئاگرەوە.

لە فەرمایشتێکی دیدا فەرموویەتی: یەکەم کەس کە خەلاٚتی بەهەشت لەبەر دەکا من و حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیلین. عەرزیان کرد قوربان! بە غەیرەز ئیوە کەسیتر دەگاتە ئەو پایە؟ فەرمووی: بەڵێ: هەر کەسێ لە پاش هەموو فەرزێک «دە» سەڵوات لە سەر من لێبدا بەو خەلاٚتە دەگا.

«صـــــلّوا عـــليه و ســـلّموا تَســـلِیما
حَـــتّی تَـــنالُوا جَـــنَّةً وَ نَـــعیما»

سەلات و سەلامی حەق لە سەر فەخری بەشەر بێ
بە قەد عیلم و حیلمی خوا هەموو کاتێ با هەر بێ
بسمِ الله الرحمنِ هەم رەحیم و موخبیر بێ
الحمد لله هەم غەففار و موقتەدیر بێ
محمّدە لە زەوی مەحموودە لە ئاسمان
موختاری کوڕی موختاری مستەفای نێو موضەر بێ
بابی عبدالله کوڕی عبدالمطلّب هاشم
دایکی ئامێنەی وەهەب نەسەب پاکی ئەطهەر بێ
ئەو زاتە موبارەکە لە دایک بوو لە «مەکە»
لە چل ساڵدا مورسەل بوو تا عالەم بەو ئەنوەر بێ
کە نووری ئەو هەڵکرا فارس ئاگری بڕا
فەیزی ئەو شەپۆلیدا ساوە قەت نابێ تەڕ بێ
لە پەنجاو دو یا سێدا تەشریفی چووە «مەدینە»
تا ئەم دینە لەوێدا هەم مەنسوور و ناسر بێ
تاقی کیسرای شەق کرد هەم شەیتانی گۆی لەق کرد
لات و عوززا لاتەی کرد کافر با قوڕ بە سەر بێ

چـــرایـــێ حـــەق هـەڵیکا بـۆ عـالەم دەبـێ وا بـێ

هـــەتا دنـــیا دنـــیایە دەبـــێ هـەر ڕەوشـەن‌تر بـێ

(عاشق)

ئەی موسڵمانینە! ڕەحمەتی خواتان لێ بێ بێ‌دەنگ و بە ئەدەب دانیشن و گوێ بگرن بۆ باسی خوێندنەوەی لە دایک بوونی گوڵی گوڵستانی نبووەت، سەرووی بوستانی فتووەت، سوڵتانی تەختی جەلالەت، ئافتابی فەلەکی ریسالەت، سەر دەفتەری ئەنبیا، تاجی سەری ئەولیا، حەزرەتی محمدە المستەفا «م» و بە دڵ و زبان تۆبە و ئیستغفار بکەن و چاوەڕوانی ڕەحمەت و بەرەکەت بن لە خزمەت جەنابی باری، چونکە لە کاتی باسی پیاوچاکاندا ڕەحمەت دەباری. بە تایبەتی ئەوە باسی وجوودی زی جوودی ڕەسووڵاللەیە، خۆشەویستی خودایە، بە هۆی لە دایک بوونی ئەو پێغەمبەرە وە بووین بە مۆمین و موسوڵمان. بە واستەی ئەوەوە زاهیر بووە نووری ئیمان، چوار یاری پێغەمبەر درووودی خوایان لە سەر بێ وەکوو حەزرەتی ئەبووبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی بن مەدحی مەولوودیان زۆر کردووە و هەمیشە بە گەورە و تەعزیمیان ناو بردووە.

خەڵیفەی یەکەم حەزرەتی ئەبووبەکر فەرموویەتی: هەر کەسێک بە بوونی لە دایک بوونی پێغەمبەر خۆشحاڵ بێ و مەولوودی بکا ئەوە ڕەفیقی من دەبێ لە بەهەشتدا.

خەڵیفەی دووهەم حەزرەتی عومەر فەرموویەتی: هەر کەسێ بە گەورە بگرێ مەولوودی پێغەمبەر ئەوە ئیحیای دین دەکا، یەعنی دین زیندوو دەکاتەوە.

خەڵیفەی سێیەم حەزرەتی عوسمان فەرموویەتی: هەر کەسێک لە خۆشەویستی پێغەمبەردا مەولوودی بکا و ماڵی دونیا خەرج بکا، ئەوە خۆی شەریکی غەزای بەدر و خونەین دەکا.

خەڵیفەی چوارەم حەزرەتی عەلی فەرموویەتی: هەر کەسێک ببێتە باعیسی خوێندنەوەی مەولوودی پێغەمبەر ئەوە بە شەهیدی دەمرێ و داخلی بەهەشت دەبێ.

عولەما و موشایخ مەدحی مەولوودیان زۆر کردووە و بە گەورەیان ناوبردووە.

شێخ حەسەنی «بصری» فەرموویەتی:

حەزم دەکرد بە قەد کێوی «ئوحود» ئاڵتونم ببوایە سەرفی مەولوودم بکردایە. شێخ جونەیدی بەغدادی فەرموویەتی: هەر کەسێ قەدری مەولوودی پێغەمبەر بگرێ لە دنیادا دەردەچێ بە ئیمان.

شێـخ مەعرووفی کەرخی کە مەعدەنی تەئسیر و ئیدراک و ئەدەبە. مـەرقەدی مونەووەری تریاکی موجەڕڕەبە فەرموویەتی: هەر موسوڵـمانێک لە بەر لە دایک بوونی حەزرەت جێگەیێک رابخا، لیباسی تازە لە بەر بکا، سفران داخا، شەمعان هەڵکا، مەجلیس موعەتتەر بکا، بخوور بسووتێنێ، زینەت بنوێنێ، تەعامات بێنێ، مەولوود نامەی لە سەر بخوێنێ، موسوڵمانان وەکۆکا، حەیف و مەیلی تێدا نەکا، ئەو کەسە حەشری دەکرێ لە گەڵ فـیرقەی ئـەوەڵین‌دا، عـەمەلی دەنـووسرێ لە عیلیین و جێگای ئەو کەسە بەهەشت دەبێ بە یەقین.

رەئیسی عولەمای عێراقی و حیجازی ئیمام فەخری رازی خوای لێ بێ رازی فەرموویەتی: هەر موسوڵمانێ مەولوودنامە وەخوێنێ لە سەر خواردەمـەنی یـان ئاوێکی پاک، هەر کەسێک لێی بخواو بخواتەوە دەبێتە پیاوێکی چاک. مەولوودی خاوەنی میعراج ئەگەر بخوێنرێ لە دراوێکی سککە رەواج، خاوەنی قـەت نـابێ موحتاج، سوڵتان العارفین حەزرەتی شێخ جەلال الدین فەرموویەتی: بە یەقین، لە هەر جێگایێک مـەولوودنامە بـخوێندرێ، چ مـزگەوت بـێ، چ خـانوو بـێ، چ سەحرابێ، لە شەوقی ئەو نامە، لە زەوقی ئەو کەلامە، لە حەلاوەتی ئەو بەزمە، لە تەراوەتی ئەو نەزمە، لە شیرینی ئەو داستانە، لە خۆش بۆنی بۆ مسـتانە لە عـەتر ئەنگیزی ئەو چەمەنە لە گوڵرێزی ئەو گوڵشەنە، مەلائێکەی عەرش و فریشتەی فەرش لە گەڵ شادی و بەشارەت و نەزافەتدا لەو مەجلیسە حازر دەبـن، سـەف دەبەستن و رادەوەستن و سەڵەواتیان لێ دەدەن و ئیستغفاریان بۆ دەکەن، وە ئەهلی ئەو جێگایە لە دەرد و بەلاّ و لە قەحت و وەبـا، لە زولمـی زالمـان و لە بـوغزی

باغیزان و لە حەسەدی حاسیدان دوور دەبن.

عولەما فەرموویانە: زۆر کەس بوون تووشی موسیبەت هاتوون مەولوودیان نەزر کردووە بێ‌زەحمەت لەو موسیبەتە خەلاس بوون. مین جوملە حیکایەت کراوە کە لە زەمانی عبدالمەلیکی کوڕی مەڕواندا جوانێک بوو، زۆر دڵی پاک بوو، زۆر لاوچاک بوو، زۆر سوارچاک بوو، رۆژێک سواری ئەسپەکەی بوو، ئەسپەکەی سەرکێشی کرد و هەڵی‌گرت، رووی کردە بەر دەرگای ماڵی خەلیفە، لەو دەمەدا کوڕی خەلیفە لەبەر دەرگا بوو، ئەسپەکە خۆی لێ‌دا و ملی شکاند، ئەو خەبەرە وەحشەت ئەسەرەیان‌دا بە خەلیفە، خەلیفە دەریای غەزەبی هاتە جۆش، دەستی کرد بە خۆش و خرۆش، گوتی: قاتیلی جگەرکوژم بۆ بێنن، لە پێش چاوم بە ئاگر بیسووتێنن، جەللاد و فەرڕاش دەرپەڕین، فەوری گرتیان و بە دەست بەستە هێنایان، ئەو کوڕە گەنجە چونکە سەعادەت یاری بوو، مەولوودی پێغەمبەر مەدەدکاری بوو، لە رێگادا لە دڵدا نەزری کرد و گوتی: ئەی خوایە! شەرت بێ ئەگەر لەو موسیبەتە رزگارم بێ مەولوودی‌یێکی زۆر چاک بکەم، کاتێ بردیان بۆ لای خەلیفە، خەلیفە لە گەڵ ئەو هەموو رقە زۆرەدا بە کوڕەکە پێکەنی و گوتی: ئەی جوان! سوێند دەدەم بە خوای ئەرز و ئاسمان پێم بڵێ: تۆ ساحیری؟ تۆ جادووگەری ی؟ تۆ چی؟ بۆچی بە هاتنی تۆ من ئەو هەموو رقە زۆرەم کەم بوو؟ کوڕەکە گوتی: ئەی خەلیفە! بە خوا ئەوانە هیچیان نازانم، بەڵام ئەوەندە هەیە لەڕێدا لە دڵدا نەزرم کرد و گوتم: ئەی خوای گەورە! ئەگەر لەو بەڵایە رزگارم کەی شەرت بێ مەولوودی‌یێکی زۆر چاک بکەم، خەلیفە کە ئەوەی بیست لە خوێنی کوڕەکەی ئازادی کرد و هەزار ئاڵتوونیشی دایە سەرفی مەولوودی بکا.

دووبارە فەرموویانە: زۆر کەس بووە هیچ عەمەلی چاکی نەبووە مەولوود کردن نەبێ،[1] بە واسیتەی مەولوودەوە عەفوو کراوە، مین جوملە حیکایەت کراوە کە لە

---

١ـ کەسێ فەرز بە جێ نەیێنێ قەت خودا سونەتی لێ قبوڵ ناکا ئەم داستانە دەوورە لە شەرع و عەقلەوە. (ناشر)

زەمانی هاروونەڕەشیددا لە شاری «بصری»دا جوانێک بوو، لە پاش ئیمان هیچ عەمەلی چاکی نەبوو ئەوە نەبێ، کە مانگی مەولوود دادەهات، غوسلی تۆبەی دەکرد و نان و تەعامی دروست دەکرد و مەولوودییێکی زۆر چاکی دەکرد، ماوەییێک لەسەر ئەو حاڵەتە بوو، بە تەقدیری ڕەببانی قەزای مەحتووم نازڵ بوو وەفاتی کرد، لەبەر خەراپیانی کەس حازری جەنازی نەبوو بینێژی لە نکاوێک دەنگێک لە غەیبەوە هات کە ئەی ئەهلی «بصرە» حازری جەنازەی وەلی‌یێک بن لە ئەولیای خوا، خەڵکی بە عام هەموو بیستیان، سەعاتەن، دەوڵەمەند و فەقیر و جوان و پیر چوون تەسلیم بە خاکیان کرد، هەر ئەو شەوە لە خەودا چاویان پێکەوت کە لە بەهەشتدا سەیر دەکا، گوتیان: خۆ تۆ لە دنیادا هیچ کردەوەی چاکت نەبوو چۆن شاد بووی بەو جێگایە؟ لەوەلاّمدا گوتی: بە هۆی بەرەکەتی مەولوودی ئەو پێغەمبەرە کە بە ئیشارەی ئەنگوشتی مانگی کرد شەق.

جەژنی مەولوودی فەخری عالەمە ڕووناکی چاوی حەوا و ئادەمە
سوپاسی بێحەد بۆ زاتی بێ چوون «سبحان اللهِ عمّا یصفون»
مالک الملکی تەنیا و بێ شەریک لە عەیب و عاران موبەڕڕا و تەریک
دانەری زەوی و حەوت ئاسمانە بەو جێ و مەکانە خۆی بێ‌مەکانە
هەڵسووڕێنەری چەرخی ڕۆژ و شەو لە عەرز و ئاسمان کێ‌یە غەیری ئەو
تاک و بێ هاوتا پاک و بێ باکە خالقی ئاو و خاک و ئەفلاکە...
سەلات و سەلام لە سەر مستەفا ڕەسوولی ئەکرەم خەتمی ئەنبیا
بباریّ دایم وەک ڕێژنەی باران سەد هەزار هێندەی خیزی ڕووباران [١]

دووبارە سەردەستەی زانایانی دین، ئیمامی شافیعی ڕەزای خوای لێ بێ فەرموویەتی: هەر کەسێک بۆ خوێندنەوەی مەولوودی پێغەمبەر مەجلیسێک تەرتیب بدا و برادەرانی دینی بانگ بکا و لە تەعامیان تێر بکا، خواوەندی ذولجەلال، لە ڕۆژی ترس و سوئال، حەشری دەکا لەگەڵ خۆشەویستانی دیندا.

---

١- زۆر لەو شیعرانە لە دیوانی حەقیقی وەرگیراون.

عولەما فەرموویانە: هەر کەسێک بە گەورە بگرێ مەولوودی پێغەمبەر و مەولوودی بکا، لە موسیبەتی دونیا و قیامەت رزگاری دەبێ، هەر وەک حیکایەت کراوە کە حاکمێک بوو زۆر زاڵم و غەددار، بەڵام هەموو ساڵێک دەیکرد مەولوودی پێغەمبەری نازدار، برازایەکی بوو زۆر دوژمنی بوو، بە تەمای جێگە و حکوومەتی بوو، هەر چەند دەیکرد زەفەری بە حاکمەکە نەدەبرد، رۆژێک حاکمەکە بە تەنیا لە خەڵوەتدا بوو، کە خەبەری زانی چۆ سەر حاکمەکەدا بیکوژێ، کە چاوی پێکەوت کەسی لەلا نییە بە فرسەتی زانی، لە ناکاو دەست بە خەنجەر لینگی دایە سەری و گوتی: ئەی حاکمی پیسی خەبیسی بەدفەر! کێ ئیمڕۆ تۆ خەلاس دەکا؟ حاکمەکە فەوری گوتی: مەولوودی پێغەمبەر، ئێستا بە تەواوی ئەو قسەی لەدەم نەهاتبووە دەر، خشتێک لە دیوار دەرپەڕی بەسەر دڵی برازاکەیدا و جێ بە جێ حەیاتی لێ بڕی نیدا هات لە ئاسمان فەرمووی: نەجاتمان دای لەبەر حورمەتی پێغەمبەری ئاخری زەمان.[1]

ئیمامی غەزاڵی لە کتێبی کیمیای سەعادەتدا دەفەرمووێ: حەزرەتی عەبباس دەفەرمووێ: لە خەومدا چاوم بە ئەبوولەهەب کەوت لە ئاگردا دەسووتا، گوتم: چۆنی؟ لە وەڵامدا گوتی: هەمیشە لە عەزابدام شەوی دووشەممە نەبێ، چونکە پێغەمبەر لە شەوی دووشەممەدا لە دایک بوو، لە مژدانەیدا عەبدێکم ئازاد کرد، لە پاداشتی ئەوەدا هەموو شەوێکی دووشەممە عەزابم لەسەر هەڵدەگیرێ.

دووبارە دەڵێن: لە شاری «بەصرا»دا پیاوێک هەبوو هەموو ساڵێک مەولوودی دەکرد، ماڵ و پارەی زۆری سەرف دەکرد، جۆلەکەیێک جیران و دراوسێیان بوو، ژنی کابرای جۆلەکە لە مێردەکەی پرسی گوتی: ئەرێ حیکمەت لەوەدا چییە کە ئەو دراوسێیەمان هەموو ساڵێک لەو مانگەدا ماڵی خۆی ئاوا بەزۆری سەرف دەکا؟ مێردەکەی گوتی: ئەو پیاوە موسوڵمانە وا زەن دەبا کە پێغەمبەری ئەوان لەو مانگەدا لە دایک بووە و گوێزەبانەی ئەو دەکا، ژنەکە شەوێ نووست، لە خەویدا چاوی

---

[1] ـ دورستکراوی حاکمانی زاڵمە (ناشر).

کەوت بە پیاوێک ساحیب نوور و جەماڵ، ساحیب قەدر و ئیعتیدال، بێ سێبەر و پڕ ئەنوار، شۆخ و شەنگ و ماە روخسار، شەکەر خەندە و شیرین گوفتار، قەد عەرعەری موکەمەر، گێو سونبولی بۆن عەنبەر، فریشتە سروشتی جەماڵ بەهیشت، فەسیح زمانی مەلیح دەهان، خۆش‌بیانی نوکتەدان، چاوڕەشی ئەبروو کەوان، ددان دوڕڕی لێو مەرجان، کوڵمە گوڵی پەرچەم رەیحان، وەک مانگی چواردە دەدرەوشا لە ناو ئەستێران، رووی کردە ماڵی جیرانەکەی موسوڵمان، لە خەوەکەیدا لە یەکێکی پرسی ئەوە کێ‌یە؟ لە وەڵامدا گوتی: ئەو ماەڕوخسارە خاتەمی ئەنبیایە، مەحرەمی ئەسراری خودایە، ناسیخی دینی عیسا و موسایە، ناوی موبارەکی محمدەالمستەفایە، ژنەکە گوتی: ئەگەر قسەی لە خزمەتدا بکەم جوابم دەداتەوە؟ وتی: بەڵێ: تەکەبوور و عینوانی نییە ئەبەدا، ژنەکە بانگی کرد یا «محمّد»! حەزرەت فەرمووی: بەڵێ: گوتی: ئەی نووری چاوم، جەرگ و هەناوم بۆچی بەم شیرینیە وەڵامت دامەوە؟ خۆ من لە سەر دینی تۆ نیم؟ حەزرەت فەرمووی: دەزانم خوا هیدایەتی داوی بۆیە وەهات جواب دەدەمەوە، ژنەکە عەرزی کرد چ بڵێم؟ فەرمووی: بڵێی: اشهد أن لا اله الاالله و اشهد أن محمداً رسول الله، ژنەکە وەخەبەر هات چاوی کەوت بە مێردەکەی تەدارەکی دەگرت گوتی: ئەوە چییە؟ کابرا گوتی: ئەوە بۆ ئەو کەسەیە کە ئەو شەو لەسەر دەستی وی قبوڵت کرد دینی ئیسلام، ئەوەی هاتە لای تۆ هاتە لای منیش الدّعاء والسلام.

جێژنی مەولوودی فەخری عالەمە — روونــاکی چاوی حەوا و ئادەمە
مزگێنی هێنا عیسای موجەڕڕەد — یَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسمُهُ أَحْمَدْ
مزگێنی هێناو رۆیی بۆ فەلەک — لێرە بۆ بەشەر لەوێ بۆ مەلەک
یانی دوای من دێی ئیسم ئەحمەدێ — لەو چاتر «نەبێ» نەهاتووە و نەدێ
ناوی موحەممەد نێو بانگ ئەمینە — لەقەب «رحمةَ لِلْعالَمينه»
تەنیا گەوهەرە لە ناو بەحر و بەڕ — هەڵبژێراوی «الله أكبر»
شەوی زهووری رەحمەت دەبارێ — نوور شەبەق دەدا زوڵمەت دەتارێ

(٥٧٠) مــــــیژووی زایـــــینی... هــەڵکرا چــرای دیــنی مــوبینی...
هەر ئەو ساڵە بوو حەملەی عام الفیل ســــاڵی واقــیعەی «طــیراً أبــابیل»
بـــەشەوی دوازدەی رەبـــیع الاول رۆژی دینی حەق سـەرکەوت لەکـەل
لە شەرق و غەرب و نزیک و دووری دنیا رووناک بوو بـە قـوبەی نـووری
لە رۆژ ئـاواوە هــەتا رۆژ هــەلات مــەلەک داوەری شــەیاتین هـەلات

جا لە کاتێکدا خواوەندی گەورە ئیرادەی کرد خەلق بکا نووری سەییدی ئێمە وەکوو حەزرەتی محمد المستەفا بێ، هـەڵی گـرت قـەبزەیێ لە نـووری خـۆی فەرمووی: ببە بە حەبیبی من بە رەسوولی من لەسەر هەموو خەڵق، لە پاشان ئەو نوورە بوو بە کۆڵکەیێک نوور تەسبیح و زکری خوای دەکرد لە پێش عـەرش و کورسی و عالەمدا بە دووسەد ساڵ. ئیمامی عەلی دەفەرمووێ: خەڵق بووە نووری سەییدی ئێمە لە پێش ئاسمان و ئەرز و عەرش و کورسی و عالەم و بەهەشت و جەهەننەم و دونیا و قیامەت و ئادەم و شیس و نووح و ئیبراهیم و سـولەیمان و مووسا و عیسادا «عَلَيْهِمُ السلامْ» بە شەش‌سەد و بیست و چوار هەزار ساڵ.

لە پاش خەڵقی پێغەمبەر خوا دووازدە پەردەی خەڵق کرد. پەردەی قودرەت و پەردەی عەزەمەت و پەردەی مینەت و پەردەی رەحمەت و پەردەی سەعادەت و پەردەی کەرامەت و پەردەی مەنزیلەت و پەردەی هیدایەت و پەردەی نبووەت و پەردەی رەفعەت و پـەردەی تـاعەت و پـەردەی شـەفاعەت، لە پـاشان نـوری پێغەمبەری بردە ناو ئەو دوازدە پەردانە و چەند هەزار ساڵ تەسبیحات و ذکـری خوای کرد لە پاشان خواوەندی عەزیم الشأن نووری حـەزرەتی بـردە بـەحری نەسرەتی، بەحری موحیببەتی، بەحری قودرەتی، بـەحری کـەرامـەتی، بـەحری سەخاوەتی، بەحری هیدایەتی، بەحری شەفاعەتی، بەحری مەعریفەتی، کاتێ لە بەحری مەعریفەت هاتە دەرەوە خواوەندی گەورە فەرمووی: جاری ببە، جـاری بوو لەوێ سەدو بیست و چوار هەزار قەترە، لە هەر قەترەیێکی پێغەمبەرێکی لێ خەڵق بوو، لە پاشان خواوەندی گەورە لە نووری خۆی گەوهەرێکی خەڵق کرد،

نەزەری کردە ئەو گەوهەرە بوو بە دوو لەتەوە، نەزەری کردە لەتێکیان بە چـاوی هەیبەت، لە ترسان توایەوە و بوو بە ئاوە جاری‌یە کە ئێستاش لە ترسی خوا قەرار ناگرێ و ئارامی نییە لە شەتاندا لە بەحراندا، نەزەری کردە لەتی دووهەم بە چاوی مەرحەمەتی، چوار ئەشیای لێ خەڵق بوو وەکـوو عـەرش و کـورسی و لەوح و قەلەمی قودرەت بێ، نەزەری کردە قەلەم بە چاوی هەیبەتی لەترسان بوو بە دوو لەتەوە، خوا ئەمری کردە قەلەم فەرمووی: ئەی قەلەم! بنووسە، قەلەم عەرزی کرد یارەببی چ بنووسم؟ فەرمووی: بنووسە هیچ خوایە نییە من نەبم، هیچ شەریکم لەبۆ نییە، «محمّد» عەبدی منە و رەسوولی منە بۆ سەر جینن و ئینس، قەلەم کە بیستی ئەو خیتابە سوجدەی برد و بەڕوودا کەوت، لە پاشان سەری بەرز کردەوە و گوتی: ئەی خوای گەورە! دەزانم کە بە تەحقیق تۆ بێ‌شەریکی، بەڵام نازانم ئەو «محمّدە» چ زاتێکە کەناوی ئەوت بەرامبەر بە ناوی خۆت راگرتووە؟ خوا فەرمووی: ئەی قەلەم! بە گەورەیی و جەلالی خۆم قەسەم ئەگەر لەبەر ئەو (محمّدە) نەبوایە، نـە عەرش و نە کورسی، نە لەوح، نە قەلەم، نە ئاسمان نە ئەرز، نە بەهەشت نە دۆزەخ، نە شەو و نە رۆژم خەڵـق نەدەکردن، ئەوانەم هەموو لەبـەر خـاتری ئـەو خـەڵق کردوون، ئەمجار خوا فەرمووی: ئەی قەلەم بڵێ: «اَلسّلامُ عَلَیْکَ یا محمّد» قەلەم بە ئەمری سوبحان هاتە زبان و سەلامی کرد، حەزرەتی باری جەللە جەلالە لە باتی حەبیبی خۆی وەڵامی دایەوە فەرمووی: «وَ عَلَیْکَ السّلام وَ رَحْمَتِی وَ بَرِکاتِی أَیُّها الْقَلَمْ». جا لەو وەختەوە سەلام کردن سوننەتە و جواب دانەوەی فەرزە. لە پاشان خواوەندی عظیم الشأن ئەمری کردە قەلەم فەرمووی: ئەی قەلەم! بنووسە لە رۆژی خەڵـقی ئادەم هەتا رۆژی قیامەت ئەحواڵـی هـەموو ئـوممەتان، قـەلەم نـووسی هەرچی گوناحکارە جێگای ئەوی نارە، هەرچـی خـاوەن تـاعەتە جـێی ئـەوی جەننەتە، تەماعی بوو بۆ ئۆممەتی پێغەمبەریش وەها بنووسێ، خوا فەرمووی: ئەی قەلەم! بۆ ئۆممەتی «محمّد» بنووسە ئۆممەتێکی گـوناحکارە، بـەڵام خـوایـێکی غەفوور و سەتتارە ئینشاء الله و تەعالا، لە پاش خەڵـقی ئەمانە خواوەندی گەورە

بەهەشتى خەڵق كرد، مانگ و رۆژ و ئەستێرەى گێڕان بەچرا، خەڵقى مەلائێكەتەكانى كرد و ئەمرى پێ كردن كە سەڵوات لە ديدارى پاكى پێغەمبەر لێبدەن.

سەد سەلام ئەى روومەتت شەمعى شەبووستانى «وجوود»
سەد سەلام ئەى قامەتت سەرووى بەهارستانى «جوود»
سەد سەلام ئەى ئەو كەسەى لەو ساوە جێى تۆيە زەوى
فەخرى ئەم خاكە «كەوا» كەوتۆتە سەر چەرخى «كەبوود»
سەد سەلام ئەى ئەو كەسەى پايەى بڵندت ژوورترە
سەد هەزار ساڵ رێ لەساحەى قوربى ئيمكانى «وجوود»
سەد سەلام ئەى زاتى پاكى تۆ بە كوێرى دوژمنان
تۆزى نەعلەينت جەواهير سورمەيى چاوى «شهوود»
سەد سەلام ئەى نوورى سەر تاريك نشينانى عەدەم
گەنجى ئەو نوورە نيهانى بوو بە تۆ كەوتە «نموود»
سەد سەلام ئەى موعجيزەت هێند زۆرە وەسفى حەدى ئەو
نايێتە گونجايشى فسحەتگەهى گوفت و «شنوود»
سەد سەلام و سەد سوپاس بۆ تۆ كە پێش ئادەم گەلێك
بۆ فريشتە تاقى ئەبرووت بوو بە ميحرابى «سجوود»
من لە كوێ و حەددى سەلامى تۆ لە كوێ «خَيْرُالاَنام»
من تكام وايە لە خواوە بێتە سەر رۆحت سەلام

لە پاشان خواى تەعالا ئيرادەى كرد خەڵق بكا باوكى ئێمە وەكوو حەزرەتى ئادەم بێ لەنەسڵى وى زاهير بكا فەخرى عالەم وەكوو محمّد المستەفابێ.

راوى دەڵێ: لە پێش ئەوەدا دنيا جێگاى ئەجيننان بوو، كە بێ‌ئەمرى خوايان كرد مەلائێكەيان هاتنە سەرێ، عەزازيل كە شەيتان بوو بە يەخسيريان برد بۆ ئاسمان، لەوێ دەستى كرد بە تاعەت و عيبادەت، بە غايەتێكى وا كە هيچ

جێگەیێک نەما سوجدەی لێ نەبا، ئوستادی مەلائێکەتان بوو، خەڵیفەی ئـەرز و ئاسمان بوو، یەکەم خەزنەداری بەهەشت بوو، ئەگەر مەلائێکەتان مەقسوودێکیان هەبایە لە بارەگای خوا، ئەو بۆی دەکردن رەجا، تەنانەت جارێک دیان لە لەوح نووسرابوو بەو زووانە یەکێک لە گەورانی خواپەرەست مەلعوون دەبێ و رووسیا، مەلائێکە دەستە بە دەستە دەهاتنە لای بۆ دوعا، دوعای بۆ ئەوان دەکـرد، بـەڵام لەبەر مەغرووریان ناوی خۆی نـەدەبرد، تـا دەفـعەیێک دی لەسـەر دەرگـانەی بەهەشت نووسراوە کە نزیکە یەکێ لە گەوران بکا بێ ئـەمری مـەلێکی مـەننان، شەیتان گوتی: یاڕەببی! ئیزنم بدە تا بە دەوام لەعنەتی لێ بکەم، خوا ئیزنیدا هەزار ساڵ دەستی لە عیبادەت هەڵگرت، عـلی الدَّوام لەعـنەتی لێ دەکـرد، لە پـاشان سوجدەی لە ئەرز و ئاسمان دەبرد. دەیدی لە جێگای سـوجدەکـەی نـووسراوە لەعنەت واللّٰەی علی الشیطان، ئەویش ئەو کەلیمەی دەگوت بـە هـەوەس، نـەی دەزانی کە لەعنەت لە خۆی دەکا ئەو سەگەی ناکەس، جا خوای هـەشتا هـەزار عالەم ئەمری کردە جوبرەئیلی ئەمین هەستە بڕۆ رووی زەمین، بۆم بێنە چنگێک گڵی ڕەنگین، کە جوبرەئیل هات ئەرز دەستی کرد بە گریان و شین، گوتی تکایە عەلاقەم مەکە، بەرۆکم بەردە، فەقیرم دڵ پڕ غەم، نیمە تاقەتی ئاگری جەهەننەم، جوبرەئیل هاتەوە حوزوور خوا واقیعەی عەرزی بارەگای ئەقدەس کـرد، ئـینجا یەک لە دوای یەک حەزرەتی ئیسرافیل و میکائیلی نارن، ئەوانیش وەک جوبرائیل چوون و هاتنەوە، لە پاشان خوای گەورە ئەمری کردە ئیزرائیل فەرمووی: هـادِمُ الذّاتْ ئەتۆی، «مفرّق الجماعات» ئەتۆی، هـەستە هـیچ مـەوەستە و مـەسرەوە، چنگێک خاک لە زەوی بستێنە و زوو وەرەوە، ئیزرائیل هاتە ئەرز دەستی کرد بە پاڕانەوە، ئیزرائیل گوتی: ئەو قسانە چییە؟ ناڵە ناڵی ژن پیاو لە لای من قەدری نییە، رەحمی پێ نەکرد، چنگێک خاکی لە رووی زەوی هەڵگرت و هاتەوە بارەگـای خوا، خواوەندی گەورە فەرمووی: ئەوە بۆ تۆ وەکوو ئەوانی دی بەزەییت بە ئەرزدا نەهاتەوە؟ گوتی: ئەی خوای گەورە! ئاخر ئەمری تۆم لا گەورەتر بوو لە رەحـم کردن بە حاڵی زەویدا هاتنەوە، خوا فەرمووی: کە وابێ ئەوا تۆم کرد بە قابیزی

ئەرواحی ئەو کەسانە کە لەو خاکەیان دروست دەکەم، گوتی: یاڕەببی! ئاخر دەبمە مەبغووزی هەموو کەس چونکوو مردن زۆر ناخۆشە و دڵی هەموو کەسی لەبەر دەلەرزێ، پشتی دەچەمێ و چۆکی دەتەرزێ، خوا فەرمووی: دەرد و بەلاّ زۆر دەکەم تا نیسبەتی نەدەنە باڵ تۆ، بەڵکوو حەملی بکەنە سەر سووتان و، کوژان و، وەبا و تاعوون و، تاو و لەرزی.

لە پاشان خوای عەظیم الشأن بە دەستی قودرەت وێنەی ئادەمی دروست کرد. ئینجا ئەمری بە ڕۆح کرد کە بچێتە بەر بەدەنی ئادەم، ڕۆح کە تەماشای کرد دیتی حوجرەیێکی تەنگ و تاریک، گریا و گوتی: یاڕەببی! ئەمن بولبولی هەزار داستانی ئونسم، قومری سەروی بوستانی قودسم، تووتی شەکەرستانی مەلەکوتم، نەغمەخوانی شاخساری لاهووتم، ناچمە ناو ئەو قەفەزەی (نۆ) کون تێ، ئەگەر بە ئاگری غەزەبت هەموو پەڕ و باڵم بسووتێ.

لە پاشان خوای گەورە ئەمری کرد بە حەزرەتی جوبرەئیل، گەوهەری نووری پێغەمبەری لە پشتی حەزرەتی ئادەم دانا، ئینجا ڕۆح کە چاوی بە نووری پێغەمبەر کەوت خۆی بۆ ڕانەگیراو، هات بە شەوق و زەوق وەژوور بەدەنی حەزرەتی ئادەم کەوت، ئینجا لیباسی بەهەشتیانی لەبەر کرد و بە حوسن و جەماڵ موزەییەنیان کرد، نووری حەزرەت لە پشتی ئادەمدا وەکوو ئەستێرە بەڕووی بەیانەوە دەدرەوشا، ئینجا خوای گەورە ئەمری کردە ملائێکەتان سوجدە بۆ ئادەم بەرن، لە حەقیقەتدا سوجدە بۆ نووری حەزرەت بوو، بەلاّم لە زاهیردا بۆ ئادەم بوو، مەلائێکە هەموو سوجدەیان برد بۆ ئادەم شەیتان نەبێ، ئەو سوجدەی نەبرد و گوتی: من لە ئادەم چاترم، ئادەم لە خاکە من لە ئاگرم، تەکەبوری کرد و سوجدەی نەبرد، خوای گەورە بە نەعلەتی کرد و لەقاپی ڕەحمەتی خۆی دەری کرد، شەیتان کە وای زانی گوتی: یاڕەببی! ئەگەر نەمردم دەبێ زۆربەی ئەولادی ئەو ئادەمە وەرگێڕم، خوا فەرمووی: ئەوا ئیزنم دای تا ڕۆژی قیامەت مردنم لەسەر هەڵگرتی ی بەلاّم دەرگای تۆبە لەوان ناگرم، گوناهیش بکەن کە تۆبەیان کرد عەفوویان دەکەم، مەلائێکە دەستە دەستە دەهاتن و سەفیان دەبەست و لە پێش حەزرەتی

ئادەم رادەوەستان، تەماشای نووری پێغەمبەریان دەکرد کـە لە جـیسم و بـەدەنی حەزرەتی ئادەم‌دا شوعلەی دەدا.

لە پاشان حەزرەتی ئادەم خەوی هات و نوست، کاتێک وەخەبەر هات دایکە حەوای لەلا دانیشتبوو دەتگوت رۆژە هەلاّت، ئادەم زۆری پێ خۆش بوو، خوای گەورە لە هەموو تەعامی بەهەشت ئیزنی دان لە خواردنی سۆیندێکی زۆری بـۆ خواردن گەنم نەبێ، شەیتان کە ئەوەی بیست چوو دەستی کرد بە عیبادەت و لەلای دایکە حەوا دەستی کرد بە گریان، لێی پرسی ئەو گریانەت لەبەر چییە؟ گوتی: لەبەر ئەوە دەگریم ئەگەر لەو گەنمە نەخۆن عاقیبەت لە بەهەشت دەچنە دەرەوە، دایکە حەوا چونکە بەهەشتی زۆر پێ خۆش بوو بە باوکە ئادەمی گوت: دەبێ لەو گەنمە بخۆین، شەیتان چوو دەستی کرد بە سوێند خواردن، ئەوانیش نەیان دەزانـی کـە کەس هەیە بتوانێ سوێند بە درۆ بخوا، چوون گوڵێکیان گەنم هێنا و خواردیان، جا لە بەر ئەو بێ ئەمری خوایە لە بەهەشتێ دەرکران و دەستیان کرد بە شین و گریان، لە پاشان ئادەم سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان تـەماشای کـرد لە عـەرشی خـوا نووسرابوو «لااله الا الله محمّدٌ رسولُ الله» گریاو هاواری کرد و گوتی: ئەی خوای گەورە! بۆ خاتری ئەو محمّدە عەفوومان بکە.

راوی دەڵێ: لەو وەختەدا ئیلهام کرا کە ئەی ئادەم! عەفووی گوناهی خـۆت و حەوات تەڵەب کرد، ئەگەر عەفووی گوناهی هەموو ئەولادت داوا بکردایە لەبەر شەرافەتی ئەو محمّدە لە هەمووان خۆش دەبووم.

بــــڕژێنە دایــــم بــەسەر پــێغەمبەر و ئــالی‌دا
بارانی رەحمەت نە وەک لە هـەورێکی دەم دەمـی
ســـوپاسی ئـێمە خـودا چ زۆری یـا خـود کـەمی
بۆ زاتـی تـۆیە کـەوا بـێ مـیسل و بـێ هـاودەمی
کە عومری خـدرت بـبێت و سـەد زبـانی فـەسیح
شوکری خواکەی کەمە هـێشتا کـە تـۆ مـوسلیمی

پـــێغەمبەرێ فـەزڵی ئــەو نـیهایەتێکی نـییە
هــەتا بـەیانی بکــا خــاوەن زبــان بـە دەمـی
پێغەمبەرێ رەمزی پەنجەی مـانگی لەت کـرد بـێ
بێشک لەلای خوای هـەیە کـەماڵی مـوحتەرەمی
پـێغەمبەرێ سـەییدی کـەونەین و چـەند طـائفە
مـەلائێکە ئـەجیننە و پـەری و بـەنی ئـادەمی
پـێغەمبەرێ زاتـی حـەق کـە بـەرزی کـردۆتەوە
بۆ عەرشی ئەعلایی خۆی بۆ دەفعی عیجزو غەمی
ئــادەم لەبــەر نــاوی تـۆ قـبولّ کـرا تـۆبەکـەی
جــەنابی تــۆ واســیتەی نـەجاتی نـوح لەیـەمی
تـۆ بـاعیسی بـۆ یـەدی بـەیضای مـووسای بـەڵێ
تۆ واسیطەی موعجیزەی عـیسای کـوڕی مـریەمی
یوسف بە تۆ عیززەتی دەست کەوت و ڕزگاری بوو
لە بیر سـولەیمان بـە تـۆ بـوو تـەختی و خـاتەمی
ڕزگــاری یــونس بــە تــۆ لەزاری مـاسی بـووە
بــۆ زامــی ئـەییوب ئـەتۆ دەرمـانی و مـەرهەمی
خۆش بی ئیلاهی لەوەی دەیڵێت و گوێی لێیەتی
لەوەش کە دوعا دەکا و پێـی خۆشە پـڕ بـە دەمـی
یــا ڕەبـبی بـۆ خـاتری مـوحیببەتی ئـەو شـەهە
ڕەحمێ بە ئـێمەش بکـەی تـۆ خـالقی ئـەعظەمی

ڕاوی دەڵێ: لە حینێکا خوای تەعالا ئیرادەی کرد ئیزهار بکا نووری حەبیبی خۆی یەعنی پێغەمبەری ئاخری زەمان، بزواندی دڵی عبداللهی باوکی پێغەمبەر بـۆ ژن خواستن. عبدالله ڕۆژێک بە دایکی گوت: دایە! بڕۆ لە ناو تائفەی قورەیشدا ژنێکم بۆ پەیدا بکە خاوەن حەسەب و نەسەب بێ، خاوەن حوسن و جەماڵ بێ، خاوەن قەدر و ئیعتیدال بێ.

دایکی ڕۆیی گەڕا یەکی چاوپێنەکەوت بە میسلی ئامینەی کچی وەهەب، هاتەوە خەبەری دا بە عبداللە، عبداللە گوتی: دایە! دوبارە بڕۆوە تەماشا بکەوە، دایکی ڕۆیی دوبارە تەماشای کرد، سەد هەزار لە جاران جوانتر و زەریفتر هاتە بەر چاوی، چوون ئامینەیان بۆ عبداللە خواست و شاییێکی زۆر خۆشیان کرد، لە شەوی جومعەدا عبداللە و ئامینە بە یەک گەیشتن، نووری «محمّد» کە پشت بە پشت لە ئادەمەوە هاتبوو، چۆ ناو ڕەحمی ئامینە خاتوونی دایکی.

ڕاوی دەڵێ: لەو کاتەدا کە نووری «محمّد» لە پشتی عبداللەدا بوو، کاتێ دەچوو بۆ چۆل و سەحرا دەی بیست دارو بەرد دەیانگوت: سەلام لە سەر تۆ بێ ئەی نووری «محمّد». دەڵێ ئەو زەمانە زەمانی فیترەت بوو. شەرع و عیلم نەبوو، بەرەکەت لە سەر ئەرز هەڵگیرا بوو، زەمانی شیرک و کوفر بوو، خوای تەعالا مەلائیکەی ناردن بۆ سەر ئەرز تا بزانن حاڵی ئەرز چۆنە. کاتێ هاتن و چاویان پێکەوت، ئەرز گریا و گوتی: یا ڕەببی! ئەوە چەند ماوەیەکە کەس عیبادەتی تۆ ناکا، دەشت و گیا شین ناکا، ئاسمان بە قەترە بارانێک ڕووی من تەڕ ناکا. حەیوانات و تەیر و وەحشی دەیان ناڵاند و دەیانگوت: ئەی خوای گەورە! ئەوە چەند زەمانە گوێمان لە زکری تۆ نیە، دنیا پڕ لە زوڵم و عیصیانە.

جا بە ئەمری ڕەببی جەلیل، حەزرەتی جوبرەئیل هاتە سەر ئەرز و مزگێنیدا کە نزیکە لە دایک بوونی سەییدی ئەووەل و ئاخر، حەزرەتی محمّدە المستەفا.

کاتێ نووری پێغەمبەر لە ڕەحەمی ئامینە خاتووندا قەراری گرت، تاقی کیسرا شەق بوو، ئاگری بتپەرستی کوژایەوە، کانی وشک ژیایەوە، هەر ژنێ حامیلە بوو ئەو شەوە کوڕی بوو، تەواوی گیان لە بەران بە غەیری ئادەمیزاد بە زمانی حاڵ گوتیان: بە شارەت بێ نووری محمّد لە ڕەحەمی دایکیدا قەراڕی گرت، مەلائیکە دەستە بە دەستە هاتن و نووریان دەباراند. ئەو شەوە دەرگای جەهەننەم کلیل درا، بەهەشت وەک بووکان موزەییەن کرا، حۆریان خۆیان ئارایشدا، سەریان لە قەسر و قصوری بەهەشت دەرهێنا، گوڵی بەهەشت پشکوتن، نەسیم ئەنگوتن، کانی وشک ژیانەوە، بولبول مەست بوون لە سەر چلاّن، نەسیم وەر بوون لە نێو گوڵاّن،

گوڵ سوور بوون، گیا پڕ نوور بوون، ونەوشە ڕەش بوون، ڕومەت گەش بـوون، نێرگس پشکوتن، لالە بزووتن، درەخت هاتنە بەر میوە کەوتە دەر، لە بـەرچـی؟ چونکە

جێژنی مـەولوودی فـەخری عـالەمە — ڕوونـاکـی چـاوی حـەوواو ئـادەمە
جـــاءَ بِــــالْهُدیٰ فِي أمِّ الْــقُرا.. — نُـــورُ مِـــثْلُهُ عَـــینٌ لَمْ یَـــرا
ئـاگـــری ئـاورگی گـاور کـوژاوە — ڕۆ چوو هەڵچۆڕا دەریـاچەی سـاوە
تـــەقی درزی دا تـــاقی نـــۆشیروان — یـــەعنی ئـیعجازی نـەبی نـۆشیروان
هـــەڵبوو چـــلچرا لە جـێگای ئـاور — گـــڕی دامـرکا چـۆڵە چـرای گـاور
عوزا بێ عیززەت مەنات بـێ مـەنات — هەبەل بـێ هـەبا نـەما قـەدری لات
تاجی لە سـەرنا شـای اوُلوُ الْـعَزْمان — چەمان پەرچەمان چەم و خەم نەمان
سەمەک تـا سـەما ڕەقس و سـەمایە — جـــێژنی مـەولوودی ڕەسـولَ اللەیـە

جا لەو وەختەدا شەیتانی لەعین هاڕاندی و دای بە سەر خۆیدا، ڕووی کـردە کێوی ئەبو قوبەیسێ، شەیاتین لە هەر چوار لاوە لێ کۆبوونەوە و گـوتیان: ئـەی باوکی ئێمە، ئەی سەرداری ئێمە! چیت لێ قەوماوە؟گوتی: خاکمان بەسەر نزیک بۆتەوە لە دایک بوونی کەسێک کە بـتان دەشکـێنێ، ئـاتەشکەدان دەسـووتێنێ، موعجیزان دەنوێنێ، سەر ڕەقان سەر نەرم دەکا، دڵ ساردان دڵ گەرم دەکا، ڕەجمی شەیاتین دەکا، هەتکی سەلاتین دەکا، مانگ بە ئەنگوشت شەق دەکـا، جـێ بـە کافران لەق دەکا، بەیداغی دین هەڵدەکا، دنیایێ ڕەوشەن دەکا. گوتیان: گەورەی ئێمە غم مەخۆ تامی گوناهیان لەلا شیرین دەکەین لە حزور خوادا خـەجاڵەتیان دەکەین، وە هەر لەو وەختەدا حەزرەتی جوبرەئیلی ئەمین بەیزنی «رب العالمین» گەڕا بە ئـاسماندا، بـە سـیدرەتولمونتەهادا، بـە جـننەتولماوادا، بـەشاڕەتی بـە ملائیکەتان دەدا و بانگی دەکرد و دەیفەرموو: مژدە بێ لە ئێوە ئەی مەلائیکە! کە نزیک بووە ظهوری کەسێکی باعیسی فەڕەح و سرورە، چرایەکی خاوەن نوورە، تاجی کەڕامەتی لە سەرە، شەفیعی ڕۆژی مەحشەرە، صاحیب موعجیزاتە، ئـەمر دەکا بە چاکە، نەهی دەکا لە خەراپە، لە ڕێی خودا غەزا دەکا، دینی بە حەق ئیحیا

دەکا، سەییدەالمرسەلینە، ڕەحمەتەن للعالمینە، ناوی خۆشی ئەحمەد و محمّد و طاها و یاسینە، هەموو بڵندان دەکا نەوی، هیچ پێغەمبەر نابێ لە پاش ئەوی، مەلائیکە کە ئەوەیان بیست دەستیان کرد بە حەمد و سەنا.

هەروەها حەزرەتی جوبرائیل بەشارەتی دا بە ئەهلی ئاسمان و زەوی و نازڵ بۆ سەر ئەرزێ لەگەڵ سەد هەزار مەلائیکە، بەشارەتیدا بە کێوان، بە بەحران، بە ماسیان و بە هەموو زیڕوحان.

ئامینە دەیفەرموو: کە حەملم گەیشتە شەش مانگە بیستم دەنگێک لە غەیبەوە دەیفەرموو: کار دروستی بکە ئەی ئامینە! بۆ وەلەدێک کە موبارەکە. کە حەملم گەیشتە حەوت مانگە عبدالمطلّب با پیری پێغەمبەر بە عبداللّٰەی کوڕی گوت: نزیکە حەڕەمت منداڵی ببێ، دەبێ گوێزبانە بکەین، لە هەموو خزم و قەبائیل و عەشایر بگێڕینەوە، عبدالله بۆ تەدارەکی گوێزەبانە چوو بۆ تەڕەفی «مەدینە» لە گەڕانەوەیدا لە ڕێدا نەخۆش کەوت و وەفاتی کرد.

مەلائیکەی حەوت ئاسمان دەستیان کرد بە گریان و گوتیان: ئەی عالمی سیرڕو خەفیان! باقی مایەوە حەبیبی تۆ بە هەتیوی، کێ هەیە بە خێوی بکا؟ کێ هەیە کە ئاگاداری بکا؟ نیدا لە لایەن خواوە هات فەرمووی: ئەی مەلائیکە! ئەمن حافیزی ئەوم، ئەمن ناصیری ئەوم، ئەمن دڵداری ئەو دەکەم، ئەمن ئاگاداری ئەو دەکەم.

کاروانی «مەکە» هاتەوە، ئەو خەبەرە وەحشەت ئەسەرەیان دا بە ئامینە و خزمان، دەستیان کرد بە شین و واوەیلا و گریان، بە تایبەتی ئامینە خاتوونی دڵ پەرێشان. دەگریا بە ناڵە ناڵ و زاری، فرمێسکی دەباراندن وەک بارانی بەهاری، لە فیراقی بابی محمدەالمستەفا و سەرداری و، ئەو شیعرانەی دەخوێندەوە زۆر بە غەمباری،

مەوالی یا مەوالی
رسولُ اللهِ کَالْبَدْرِ اللَّیالی
موسڵمانان بزانن گوێ بدێرن
ئەوە ئامینەیە دەگری و دەناڵی

فەلەک بۆچ وات لەگەڵ مـن کـرد لە دنـیا
لە یـاری خـۆت جـودا کـردم بـە تـاڵی
بـە عـبداللە دڵـم خـۆش بـوو لە بـەرچـی
لە پـێش چـاوانـی ون کـردم جـەماڵی
جـەماڵی گـەر وونـە ئـەمما بـە مـەعنی
لە بـۆ مـن مـۆنیسە فکـرو خـەیاڵی
جـەوانـا نـامرادا بـۆچی وا زوو
ویـداعت کـرد لە نـێو ئـەهل و عـەیاڵی
لە دنـیادا ئـەگـەر لێکتر جـودا بـووین
لە جەننەت پێم عەطا کـا حـەق ویـصاڵی
قـەدی بـەرزی نـەمامی پڕ سـەمەر بـوو
حەیات و عەیشی من بوو خـەتت و خـاڵی
دوو ئەبرۆو چاوی مەستی غەم ڕەوین بوون
بـە جـێی هـێشتم لە مـاڵی چـۆڵ و خـاڵی
کـە ڕۆیشـتی لەلام ڕوووحـی ڕەوانـم
ئـەمن سـووتام لە تـاوت وەک زوخـاڵی
زەلیـل و بـێ کـەسم جـەرگم کـەبابە
ژیـان و عـومری شـیرین بـوو بـە تـاڵی
شـەوو ڕۆژێ لە تـاوی ڕووی جـەماڵت
دڵ و جـانم وەکـو نـەی هـەر دەنـاڵی
فـغان و ئـاهـ و واویـلا لە دووریت
هـەتیو مـاوە حـەبیبی ذولجـەلالی
درێـغا بـۆ جـەماڵی مـاهی تـابان
بـە بـێ بـاوکی چـلۆنە ژیـن و حـاڵی

نـــــەمێنم بــۆ تــۆ ئــەی بــابی مــحمّد
له پـاش تـۆ مـن چ لێبکەم عـومر و مـاڵی
له دووری تــــۆ نــــەما عــــبدالمــطلب
دڵــی مـن چـۆن نـەسووتێ تـن بـە حـاڵی

خودا فەرمووی:

مــــنم حــــەقدار و غــــەمخوار    منم تەرتیب دەری عەقڵ و کەماڵی

ئامینه دەیفەرموو: ئەووەڵی مانگی حەملم له لەززەتی خەودا بووم، چاوم کەوت بە پیاوێکی صاحیب هەینەت و ئیعتیدال، صاحیب حوسن و جەماڵ گوتی: مەرحەبا له تۆ ئەی محمّد! پرسیم تۆ کێی؟ فەرمووی: منم ئادەمی باوکی هەموو بەشەر، فەرمووی: بەشارەت بێ له تۆ ئەی ئامینه کە حامیله بووی بە سەییدی بەشەر، بە فەخری قەبیلەی ڕەبیع و موضەر له مانگی دووەمدا چاوم کەوت بە پیاوێکی گورە و ڕەئیس فەرمووی: (السلام علیک یا رسول الله) گوتم: ئە تۆ کێی؟ فەرمووی: شیسم بەشارەت بێ له تۆ ئەی ئامینه کە حامیله بووی بە خاوەنی تەئویل و حەدیس. له مانگی سێیەمدا چاوم کەوت بە پیاوێک زکری خوای دەکرد فەرمووی: السلامُ علیک یا نَبِیَ الله گوتم: ئەتۆ کێی؟ فەرمووی: منم حەزرەتی ئیدریس مژدە بێ له تۆ ئەی ئامینه کە حامیله بووی بە سەییدێکی ڕەئیس. له مانگی چوارەمدا چاوم کەوت بە پیاوێک دەتگوت ڕووحە. گوتم ئەتۆ کێی؟ فەرمووی: ئەمن ناوم نووحە مژدە بێ له تۆ ئەی ئامینه کە حامیله بووی بە صاحیبی نەصر و فتوح. له مانگی پێنجەمدا چاوم کەوت بە پیاوێک بۆنی خۆشی دەهات وەک بۆنی (عود) فەرمووی: السلامُ علیک یا صَفْوَةَ الله. گوتم: ئەتۆ کێی؟ فەرمووی: منم حەزرەتی «هود» گوتی: کێ بێ بە میسلی تۆ ئەی ئامینه کە حامیله بووی بە خاوەنی مەقامی (مەحمود). له مانگی شەشەمدا هات پیاوێکی بە تەعظیم و تەعجیل، فەرمووی: السلام علیک یا رحمة الله. گوتم: ئەتۆ کێی؟ فەرمووی: منم حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیل، مژدە بێ له تۆ ئەی ئامینه کە حامیله بووی بە پێغەمبەرێکی جەلیل. بە هاونشینی حەزرەتی جوبرەئیل. له مانگی حەوتەمدا هات

زاتێکی لاوچاک و فەصیح فەرمووی: السلام علیک یا مَنْ اِخْتارهُ الله. گوتم: ئەتۆ کێی؟ فەرمووی: منم حەزرەتی ئیسماعیل زەبیح، مزگێنی بێ لە تۆ ئەی ئامینە کە حامیلە بووی بە پێغەمبەرێکی فەصیح و مەلیح. لە مانگی هەشتەمدا چاوم کەوت بە پیاوێکی عالی شان فەرمووی: السلام علیک یـا خـیرةَ الله گـوتم: ئـەتۆ کـێی؟ فەرمووی: منم مووسای کوڕی عیمران بەشارەت بێ لە تۆ ئەی ئامینە کە حامیلە بووی بە صاحیبی قورئان. لە مانگی نۆهەمدا چاوم کەوت بە پیاوێکی موبارەک قەدەم فەرمووی: السلام علیک یا رسولَ الله گوتم: ئەتۆ کـێی؟ فـەرمووی: مـنم عیسای کوڕی مریەم مژدە بێ لە تۆ ئەی ئامینە کە حامیلە بووی بە پێغەمبەرێکی گوڵ غونچە دەم و لە سەرت لادەچی دەرد و غەم و غوسسە و ئەلەم.

تا «نۆ» مانگە تەواو بوو لە هەر مانگێکدا پێغەمبەرێک لە غەیبەوە مژدەی دەدا بە لە دایک بوونی حەزرەتی محمدەلمستەفا.

یا حبیبی کُـنْ شـفیعی یـا رسـولَ الله أمـان
أنتَ حَـــقٌ صِـدْقٌ یـا نَـبِیَّ الله أمـــان
أنتَ أحمد. أنت أحْیَد، یـا محـمد مـصطفیٰ...
أنتَ حامد، أنتَمحمود یـا حـبیبَ الله أمـان
أنتَ رحمـــة، أنتَ نـعمة أنتَ نـورٌ مجـتبیٰ
یا شفیعُ و یـا مشـفَعْ سـعدَ خَـلْقِ الله أمـان
أنتَ ســایِد، أنتَ فـایز، أنتَ طـاهِرْ مُـنتَقیٰ
أنتَ غـوثٌ أنتَ غـیثٌ یـا صَـفِیٰ الله أمـان
أنتَ ناصِر، أنتَ منصور صاحِبُ النصرِ اللّوا
أنتَ سائق أنتَ صادِق خیَر حزبِ الله أمـان
أنتَ داعِ، أنتَ مـدعو سـیرَ مِـعْراجِ العُـلا
أنتَ واصِل، أنتَ مُوصِل یا کـریم الله أمـان
یا بشیر و یـا نـذیر وأنتَ بُـشریٰ الانـبیاء
یا قـویّ و یـا مـتین و یـا أمـین الله أمـان

رَبِّ صَـــــلِّ رَبِّ بـــــارِك الامــــان
للكـــريم بـن الكـريمِ يـا حـبيب الله أمـان
يا حبيبي إِشـقِ حـقِ عـوضَ كـوثرَ بِـالدِّلا
يا كريمُ و يـا رحـيم و أنت لطـفُ الله أمـان

دانەری ئەو کتێبە دەفەرموێ: کاتێک ئەووەڵ شەوی مانگی مـەولوود هـات، حاصڵ بوو لە بۆ ئامینە کەیف خـۆشی و فـەرەح و سـرور، لە شـەوی دووەمـدا موژدەیان دا بە حصولی مەقصود، لە شوی سێیەمدا گوتیان: نزیک بووە وەختی کەسێک کە حەمدی ئێمە دەکا، لە شـەوی چـوارەمـدا دەیـفەرموو: دەم بـیست تەسبیحی مەلائیکەتان بە ئاشکرا، لە شەوی پێنجەمدا چاوی بە حەزرەتی ئیبراهیم کەوت لە خەودا دەیفەرموو: مژدە بێ لە تۆ ئەی ئامینە بە ظهوری حەبیبی خوا. لە شەوی شەشەمدا زاهیر بوو نوور لە ئـەطرافدا. لە شـەوی حـەوتەمدا مـەلائیکە مژدەیان دا بە فەرەح و سرور. لە شەوی هەشتەمدا نـوورم دەدی بـە ئـاشکرا. لە شەوی نۆیەمدا بەشارەتیان بە یەکتر دەدا خیف و مـینا. لە شـەوی دەیـەمدا دڵـم ڕووناک بـوو وەک چـرا. لە شـەوی یـازدەهەمدا دەمبـیست زکـر و تـەسبیحی مەلائیکەتان بە ئاشکرا. لە شەوی دوازدەهەمدا گوێم لێ بوو بە زمانی حاڵ گوتیان:

ڕۆژی خۆش بەختی هەڵات — شـەوگاری مـەینەت لاچـوو
پێک هات ئـارەزو و ئـاوات — عـالەم لە خـەم ڕاهـی بـوو
وەختی کەیف و شادی هات — دنـــیا دەگـــۆڕێ زۆر زوو...
زەمـــانە کـــەوتۆتە هـــات — ڕەنگی خۆشی نـیشت لە ڕو
هـەوری ڕەحـمەت پـێکەنی — نـــەسیمی ئـــیحسان بـزوت
حەق گەییە دەست خـاوەنی — غونچەی سەعادەت پشکوت
ئـــامینە مـــوژدەی داوە — ئـــەو شـــۆ بـــەری بـەیانی
خـــودا کـــوڕی پـــێ داوە — تـــیفلێکە زۆر نـــوورانـــی
زۆر شیرین و جوان خولقاوە — عـــالەم مـــات و حـــەیرانـــی
مـــحمدیان نـــاو نـــاوە — سـەر و مـاڵمان قـوربانی

هەر چەند تیفلە و مندالْە — سەرداری ئەنبیایە
بێ باوک و پار و مالْە — ماقوولْی لای خودایە
خاوەن عەقلْ و کەمالْە — هەتا تۆ بلْێی وایە...
لە سەر تا پای جەمالْە — تەعریفی لە گوتن نایە
نەجات بوو لە تەنگانە — خودا وای کرد موقەددەر
عالەم کەوتە فەرەحانە — پێو قەدەمی پێغەمبەر

جا لەو کاتەدا خوای گەورە ئەمری کرد بە جوبرەئیل فەرمووی: ئەی جوبرەئیل! بە دەرکەوانی بەهەشت بلْێ: دەرگای بەهەشت بکەنەوە. ئەی جوبرەئیل! بانگ بکە لە ئاسمان، لە ئەرزێ کە نزیک بۆتەوە لە دایک بوونی پێغەمبەری ئاخر زەمان. ئەی جوبرەئیل! سێ ئالاْ هەلْکە، یەک لە مەشریق، یەک لە مەغریب، یەک لە سەربانی کەعبەت واللە.

ئامینە دەفەرموێ: چوار ژن هاتن لە دەورم دانیشتن دلْخۆشیان دەدامەوە، تەماشام کرد حەزرەتی جوبرەئیلی ئمین بە ئیزنی رب‌العالمین هات و شابالْی بە سەر سگمدا مالْی فَوَضعْتُ النَّبِيَ الهادی.

أللهم صلّ على سيدنا محمد صلاةً تُنجِينا بِها مِنْ جَميعِ الأَهوالِ واللآفات وَ تَقْضِ لَنا بِها جميعَ الحاجات. و تُطَهِّرُنا بِها مِنْ جميعِ السَّيئات. وَ تَرْفَعُنا بِها عِنْدَكَ أعْلى الدَّرجات و تُبَلِّغُنا بِها أقصىٰ الغاياتِ، مِنْ جَميعِ الخَيراتِ فِى الحياةِ وَ بعدَ المماتِ. إنكَ سَميعُ قريبُ مُجيب الدّعوات. أللّهم تَقَبَّلْ مِنّا ثوابَ تلاوةِ مولدِ نبيّكَ الكريم. و وَفق المسلمينَ على طاعتِكَ وَ نَشْرِ الّدين. وَ تَقَبّلْ مِنّا وَ مِنْ صاحبِ هذه الخيراتِ لِمولدِ نبيّكَ الرَّحيمِ بِحُرمةِ القرآن العظيم. الفاتحة

سُبحانَ رَبِّكَ رَبِّ العِزّة عمّا يَصِفُونَ و سلامٌ على المرسلين و الحمدُللهِ رب العالمين.

مەولودنامەو پێغەممەری

تەئلیفوو مەرحومو

# سەیید عبداللە و بڵبەری
# (سەیید)

دەرجەش بەرز بۆ

مەلا رەحمانی سلێنی
نویستەنەو ئامادەش کەردەن پەی چاپی

بسم الله الرحمن الرحيم

بــە نــام بــێچۆون قــەييوم ئــەكــبەر
كـــارسازى كـــاران دەهـــەندەى داوەر
نگـــارندەى چـــەرخ ئـــەرز و ســەماوات
تەصويركێشى تەرح لەوحى مـەوجوودات
ئــارندەى نــەبات جــە قــەطرەى واران
نـــۆمايندەى ذيب زيـــباى نگـــاران
نـــەقاشى گـــۆناى دڵـفەزاى گـولاّن
چـــراى ڕوح ئـــەفزاى گشت زنـــدە دلاّن
كێ سزاى ثەناى وەصفى ئـەو پێشەن
وەصـــفى واصـــفان هـەم ثـەناى وێشـەن
كـــيانان پـــەيمان خـــتم المـرسلين
كـــەردش بـە ڕەحـمەت پـەرى عـالمين
صـــەلات و سـلام خـاصەى بـێ عـەدەد
ئـــەوڕوى دڵ فـــەزاى نـــوورى مـــحمّد
هـەم ئالو ئەصحاب خـولەفاى راشـدين
ئـەولاد و ئـەزواج پـاكـى طـاهرين
مەشمول بان بـە نـوور پـادشاى ئـەكـبەر
تـــاقام قـــەيام بـــە دەوام يـــەكســـەر
يـــاران بـــزانـدى مـولود ڕەســـول
شـــاى قـــابَ قـوْسَيْن شـەفاعەت قـبوڵ

ریوایەت کەردەن جەمعە ێوە جەلیل
تەوەللودش بێ ئەو جە عام‌الفیل
شەوی دوازدەی ربیع الأول
ئامان بە دنیا موصطەفای مورسەل
جلوەدا جەماڵ نوٚر سەرمەدی
ڕەوشن کەرد زومرە دینی ئەحمەدی
موژدەی بەشارەت ڕەسول خاتەم
سوننەتەن کالفرض بیەن پەی ئومەم
کەردەنشان مەولود ئیمامان دین
هەرساڵی پەرێ سەیید پاک دین
پێسەش فەرماوان سەیید مسعود
هەر کە سەیوپەی من مەکەرو مەولود
واجب مەبۆم سەرکەروش شەفاعەت
نەجاتش بدە و جە ڕوی قیامەت
واتەن ئەبوبەکر صەددیق ئەکرەم
هەر کەس قەرانەیو مەولود خاتەم
کەروٚ بە تەحقیق بێ شک و لاڕیب
مەبوٚ ڕەفیقم نەڕاگەی جەننەت
پێسەش فەرماوان هەم ئێمام عومەر
هەرکەسەیو مەولود سەیید سەروەر
بگێر ۆ تەعظیم بەو تەورەن جەلام
زندەش کەردەبوٚ ئەی دینی ئیسلام
پیسەش فەرماوان عثمان ذی النورین
هەر کەسەیو مەولود سید الکونین

قــــەرانێ بـــــدۆ بـــوانـــاش نـــەبەین
مەنویساش غەزای ڕووی بەدر و حـــۆنەین
پـــێسەش فـــەرماوان هـــەم ئیمام عـلی
هـــەر کـــەسەیو مـــەولود رسـول جـەلی
بگــــێرۆ تـــەعظیم بـــەر بـــەرۆ ئـیمان
بێ حیساب مـلو پـەی رەوضـەی جـینان
باز هەم شەیخ حســن جـە بـەسرا زەمـین
ئــــەولیای کــــامڵ گـــەورەی تـــابعین
وات ئەر کۆی ئەو حود پـەیم مـەبێ طـلاّ
مـــەکـــەردم مـــەولود پـــەی رســـول الله
باز هەم شەیخ جونەید جە بە غدا زەمـین
ســـید طـــاییفەی فـــــەخرالعـــارفین
وات هەر کەس خودا کـەردەبوش قـەبوڵ
بـــــلۆ بگـــێرۆ مـــەجلیس ڕەســـولﷺ
تـــەعظیمش گـــێرۆ بـە جـود و ئـیحسان
خـــودا مـــوشەررف کـەرۆش بـە ئـیمان
پـــێسە نـــە مـــەجلیس ڕســـول خـــاتەم
نـــیشتەبو ئـــەو کـــەس بـێ زیـاد و کـەم
مـەستی جـام مـەی مـەعروفی کـەرخـی
واتەن هەرکە سەیو تەبعش بـۆ سـەخی
مـــوهەییا کـــەرۆ تـــە عـــام و شـــەراب
چراوەو عەتر و عود هـەم قـەند و کـەباب
بـــەرادەرانش جـــەم کـــەرو یـــەک ســەر
بـــوانـــان مـــەولود ســـەیید ســـەروەر

حـــەشرش مــەكــەران (مــع النّــبيّن)
مـــــەنزلش مــــەبۆ ئــــەعلا عـــلّيێن
هــەم ئــيمام فــەخەر ڕازی فــەرماوان
ئــەر وێــيۆ مــەولود بــە ئــاوی ڕەوان
هــەر كــەس بــنۆشۆ جــەو مـاءطهور
داخــڵ بـۆ نـەتۆی قـەلبش هـەزار نـوور
هەم داخڵ مـەبوش دڵ هـەزار ڕەحـمەت
بـەرمار و هـەزار غِـلّ و هـەزار عـيللەت
گــرد جـە بـەرەكـەت مـەولود سـەروەر
نوور و ڕەزای حەق مـەوا ڕۆش وە سـەر
بـــاز ئــيمام فــەخەر ڕازی فــەرماوان
ڕازی بــۆ چــە نـەش حـەيی لامـەكـان
هەر كـە سـەيو مـەولود سـەيیدی سـالار
وانــــۆ بــە نــوقره طــلاّی سكــەدار
ئـــەو زەڕ بكـــــريۆ بـــەئامێتەی زەڕ
حەق مەوزوش وەنـە بـەرەكـەت و فـەڕ
كـــيسەی ئــەو جـە زەڕ نـمە بـۆ خـاڵی
فـــەقير نـــمەگــنۆ نـمەبۆش تـاڵی
بـاز هـەم فـەرماوان ئـيمام فـەخرەالدیّـن
هەركەس مـەكـەرۆ مـەولود بـە تـەمكين
تـەشريف مـــەبەرۆ سـەيید سـەروەر
بـە شـوعله و جـەماڵ دڵ فـەزای ئـەنوەر
وەيـانەی ئـەوكەس مـەولودش كـەردەن
ماڵ و وێش نەڕای ڕەسول خەرج كەردەن

مـەبۆ بـە ڕەحـمەت تـا ئـەبەد پـەیشان
حـەق زیـاد کـەرۆ عـەمرو مـاڵشان
قـەبوڵش کـەرۆ بـە ئـەومەتی وێش
شەفاعەت جـەلای حـەق وازوو پـەرێش
بەخ بەخ جەو لەقـاو یـومن و بـەرەکـەت
کـە تـەشریف بـار و جـەنابی حـەزرەت
باز هـەم فـەرماوان بـو زورگـی سـەروەر
ئـیمام شـافعی شـەریعەت پـەروەر
هـەر کـەسەیو بـلو مـەولود حـەزرەت
بـە تـەحقیق لوان گـوڵزار جـەننەت
ئـەمما پـا شـەرتە پـەی حـوببی رەسـول
بـلۆ ئـەو مـەجلس نـەک بـە دڵ مـەلول
حەزرەت وات هەرکەس چەنەم موحبەت
کـەرۆ بـۆم ڕەفـیق نـەڕاگـەی جـەنەت
جـەهەر یـانەیوە یـا مـزگی و مـەحەل
بـونیۆ مـولود مـوصطەفای مـورسەل
مـەلایک تـیپ، تـیپ مـەیانی ئـەووار
مـەوارنـان ڕەحـمەت و ڕووی ئـەو دیـار
سـافین و حـافین چـەنی کـەڕرو بـین
هـەم مـوتەوەفون چـوار مـوقەڕرەبین
جە عەرشی ئەعزەم سەڵەوات و ڕەحمەت
ڕوی ئەو کەس مەولود کەردەن بە عادەت
مـوعجیزەی مـەولوڎ بـێ نـهایەتەن
جـە هـەر کـتابێو چـەند حکـایەتەن

صَـــلّوُا عَـــلَيْهِ وَ سَـــلِّـمُوا تَسْـلِيماً
حَـــتّىٰ تَـــنالُوا جَـــنَّتاً وَ نَـــعِيماً

یاگیٚ قەصیدە و شیعر وە نایەوٚ

وَ صَـــلّىٰ اللهُ عَـــلىٰ دُرِّ جـهان پـوڕ بـو لە نـووری وەی
لە عـەشق ئـەو دەنـاڵێنی دەفـی دەرویش و نـای و نـەی
فیدات بم نازەنین خوٚم، لە بـەرچیٚ لیٚم نـەظەر نـاکـەی
بە تەئثیری لە بی لاڵەت لە جـەرگ و دڵ ئـەثەر نـاکـەی
بە تیری تیژ خویٚن خارت بە چـاوی مـەست و بـیمارت
بە نوطقی شەککەرین بـارت دڵـی زارم نـەکـردت حـەی
دووچاوی نەرگیسن وارت دو زوولفـی عـەنبەرین بـارت
ئەگەر ئەمجارە بنویٚنی دەڵیٚم ئـوٚخەی دەڵیٚم ئـوٚخەی
دڵم بوٚ خاڵی موشکینت لە بـوٚ دو زوولفـی چـین چـینت
ذەلیـــل و زارە بـــوٚ دیـــنت بـیٚنایم بـوٚ نـەظەر نـاکـەی
لە دووری سەروەکەی بالاٚت لە هیجرانـی گـوڵی ئـالاٚت
لە بوٚ ئەو سورمەکەی پالاٚت بکەم گریان و شین تا کـەی
لە بـادەی چـاوی بـیمارت خـەیاڵی خـاڵی ڕوخسـارت
شوعاعی شەمعی دیـدارت بـدەر پـیٚم یـەک پـیاڵە مـەی
لە بەر مەستی دوو چاوانەت دڵ و ڕوحـم بـە قـوربانت
دەڕژیٚنیٚ چاو لە هیجرانەت شەتی فرمیٚسک پەی دەر پەی
لە عـــەشقت عـارف عـاقڵ دەنـاڵی هـەر وەکـو بـوڵبوڵ
لە ڕوٚژ و شەو نیە غافل ضەعیف و زەردە هەر وەک بەی
ئەگـەر مـن سـاعەتیٚ بـالاٚت ببینم جـلوە کـادەر سـات
موسەللەم ثابتە و نـایدەم هـەزاران تـاج و تـەختی کـەی

عەجەب ماوم لە بەر حوسنت خەدیوی کشوەر حـوسنت
کە تـۆ نـەسلی قـوریشی مـەککـی هـاشمی قـوصەی
نــەبوگەو نــابێتە هــەرگیز دوورڕ مــەکــنونی فـاخرە
وەکو تۆ لە صەدەف بەحری مەدینە و ئەبطەحی مەککەی
چ نــیسبەت نــیسبەت عـبداللهی عـارف بـە نـەسڵ تـۆ
نەبوگە و ناگریٚ نیسبەت بە ذاتی پاکـی تـۆ هـەی هـەی
خودایا نەیکەی ئـەو ڕووژە کـەمن دوور بـم لە دیـدارت
بە مەحضی فەضڵ و ئێحسانت بدە ئـەو ڕۆژە لێـم لادەی

بــاز یـٚـو لازەمـەن مـوعجیزەی مـەولود
بکــەرمێ بــەیان بــە ئــەمری مـەعبود
ئەگەر چی کە سـەیو حـوببش بـۆ نـە دڵ
پــــەریٚ ســـەنا و پــەند نـمەبوٚ مــاتڵ
وەلیٚ بــــاسی دۆس شــیرینەن یــەقین
مـایەی حـەیاتەن پـەی دڵ و پـەی دیـن
خــوصوصەن بـۆ دۆس ڕەسـولی خـاتەم
چــرای هــیدایــەت ئــەولیا و ئــومەم
هەر کەسەیو صەڵوات بـدوٚ شـای لەولاک
خــالق فـەرماوان مـەلەک جـە ئـەفلاک
یەک وە دە مەدان وە ڕوی ئـەو صـەڵوات
صەڵواتی مـەلەک بـە غـوفڕان دەر سـات
حەزرەت فـەرماوان هـەر کـەسەیو نـامم
بــــەرانــیٚو صــەڵوات نــەدوٚ دیــدارم

ئەو کەس بە خیلەن دۆورەن جە ڕەحمەت
بە تاقیق کەردەن گوم، ڕاگەی جەننەت
هەرکەسێو صەلۆات بدۆم بە دیدار
جە دنیا و عوقبا مەبۆ ڕەستگار
ئەگر ئوممەتم یەک سەر دوعای وێش
کەرۆ بە صەلۆات خاستەرەن پەرێش
پەی موهیممی دین یا دنیا صەلۆات
ئەگەر بوانیو حاصەڵ بۆ دەرسات
پەری دنیا و دین هەم نەذری مەولود
هەر کەسەیو کەرۆ حاصەڵ بۆ مەقصود
عادەتێن شەریف بیەن موجەررەب
تەجرە بە کریان عەجەم تا عەرەب
عولەمای عامل کەردەن ڕیوایەت
جە یومنی مەولود چەندەیو حکایەت

**یاگێ قەصیدە و شێعر وە نایۆ**

شەخصێ بێ جە عەهدی هارون الرشید
جە بەد ئەطواری مثلش نا پەدید
فاسق و فاجر بەد گۆ بەد ڕەفتار
گا قومار بازو گا بێ شەراب خوار
جە بەد ئەعمالی کەس نەبێش نەظیر
جە هیچ ئەفعالێ نەکەرێ تەقصیر
چون دین و دنیاش دابێ خەسارەت
نەظەر لێش مەکەرد خەلق بە حەقارەت

ئەمما (صیفەتە یو) خـاسش بـێ ئـەفضەڵ
جـــە وخـــتی ئـــامای ربـیع الأول
مـــەپۆشا لبـــاس پـوختەی نـازەنین
جـە سـەر تـا قـەدەم بـۆوەش عـەنبەرین
ئـامادە مـەکـەرد ڕەنگـا و ڕەنگ طـەعام
جە گەرد ئـەلوانـەیو بـە قـەدر یـۆ تـەمام
مـەجلس ئـارای مـەگـرت بـە عـیززەت
مەوەندەن مـەولود نـامەی ئـەو حـەزرەت
کەردەبێش عادەت گرد ساڵ یـۆ بـەیتەور
مـەکـەردش مـەولود سـەیید سـەروەر
حـوببی مـەولودش تـەمام بـێ کـامڵ
ئەو حوبب و ئەو شەوق لێش نەبێ زائـیڵ
ئـــاخر بـــە تـەقدیر پـادشای وەدوود
وەفـاتەش فـەرما جـە وادەی مـەولود
چون جـەلای مـەردم فـاسق بـێ نـاپاک
کەس ناما بـە ڕاش بسپاراش بـە خـاک
لاشەش ماتڵ مەن کـەس لێش نـەپەرسا
مـەردم واچـینش یـەهود یـا تـەرسا
دیشان صەدایـەیو جـە عـەرشی ئـەعظەم
مـاچو یـا ئـەهلی بـەصرە زوودەر دەم
جەم بـیدی پـەی دەفـن ئـەولیای کـامڵ
تـەکـفینش کـەردێ بـە نـەوعی ئـەفضەڵ
مـۆمنان شـار حـاضربین جـەو دەم
بـە عـەطر و عـەبیر خـاصەی مـوحتەرەم

ئەو شەخصە کەردەن تەکفین و تەدفین
مەعلوم بی‌لاشان ئەولیان یەقین
ئەولیای زەمان گرد دیشان نەخا و
پوشیان وە بەرگ حللەو بۆ گولاڵ و
واتن ئەی جوان نە رای جەننەت
یەچون یاوان پێت ئەی فەضڵ و ڕەحمەت
واتش جە سایەی مەولود حەزرەت
پێم عەتا کەردەن پادشای وەحدەت
خۆشا بە حاڵش ئەو ذی سەعادەت
مەولود حەزرەت کەردەن بە عادەت[1]
هەر کەسەیو مەولود کەرۆ بەودەستور
جەو خاستەر مەداش شەرابەن طەهور
سەرمایەی طاعەت حوببی ڕەسولەن
جەلای حەق موحب ڕەسول مەقبوڵەن
صلوا علیه و سلموا تسلیما
حتی تنالوا جنتا و نعیما

**یاگێ قەصیدە و شێعروە نایۆ.**

یۆتەر جە ئەعجاز مەولودی ڕەسوول
جە شاری بەغدا جوانێو مەقبوڵ
ڕوێ جە تەقدیری ربّ العالمین
ئەسپش ڕازنا سوار بی وە زین

---

١ـ ئی حیکایەتێ پەی هورنای خەڵکین پەی کارخاسەی ئێنا کەسێ فەرز بە یاگێ نارۆ سونەت بە تەنیا دەردەش مەوەرۆ وە ئی حیکایەتێچە پەی گردکەسی نیا • فەرز تەرک کەری بەتەما و مەولوودی بی، خیلاف و شەرع و خوا پیغەمەرین (ناشر).

ئـەسپێو بـێ سـەرکەش پەهند و طـەییار
چـون ئـاهو مـەویەرد نـەدەشت و کـۆسار
هـەر چـەند ئـەو جـوان بـەزۆر و قـووەت
مـەکـێشا لغـام ئـەسپی بـێ مـورووەت
بە تەر تەر ئەو ئەسب تـوند مـەبێ پـەی تـاو
جـە تـوندی طـەیران نـمەبێ سـیر ئـاو
پـەرێ تـەماشا مـەخلوقات صـەف صـەف
نگـای ئـەو سـەوار کـەردەن هـەر طـەرەف
سـواری شـیرین بـرِیش تـەمای وێش
راکب و مـەرکەب مـەویەران بـێ خـوێش
مـدرابـێنە راش طـفلـێـوە شـیرین
دڵ فـەزای دڵ بـەند تـەمام نـازەنین
سـونبول مـونفەعل مشکـی نـەورِەستەش
نەرگس شـەرمەندەی دو دیـدەی مـەستش
جـەبین قـورص نـور لەقـای سـوبحانی
نـە مـام بـاغچەی فـەزای رِوحـانی
عـارض گـوڵ وەرەق سـورشتەی قـودرەت
لیـو لەعـل یـاقوت خـەزینەی دەولەت
دەهـەن چـەشمە سـار، مـای زینـدەگـانی
دنـدان مـرواری چـەرمە و نـورانـی
ئـەبرۆی هـیلالیش چـوون نـون و قـەلەم
بـەدیع صـنعەتەیو جـە سـەر تـا قـەدەم
قامەت وێنەی ئـەلف سـەر لەوحـی هـەستی
سـەرمەشقی عـرفان خـودا پـەرەستی

بـەو شیوەی شـیرین جـە سـەر تـا دامـان
کـەوت نـە ژێـری پـای ئـەسپی ئـەو جـوان
قـــابض دەس کـێشا بـــەر ئـــاوردش ڕۆح
بـەردش پـەی جـەننەت بـە هـەزار فـتوح
فـــەرزەندی دڵکـــەش پـادشای بـەغدا
پـەی ئـەو نـەورەستەی گـەنجی بـێ بـەها
چون ئەی غـەزڵین کـەرد ئـەسپی ئـەوجوان
مــــدراوە دەرلا جـــە تـــوندی طـــەیران
دەرســاعەت خــەبەر بــەردشان پـەی شـا
مــەرگی ئـەو فـەرزەند جـەبین وێـنەی مـاه
بیزار بی جە مـوڵک لا بـەرد تـەخت و تـاج
دەردش بـێ دەرمــان زامش بـێ عـیلاج
شـیوەن کـەوت سـەرای پـادشای سـالار
پـەی مـەرگی فـەرزەند دڵـبەندی نـازار
واتش بـــاوەردی پـــەرێم ئـــەو قـاتڵ
تـا چـەنی فـەرزەند کـەرۆش مـوقابیل
دەرســات مـەئموران ڕەوان بـین پـەی شـار
گرتشان بـــــە دەس ئـــەو جـــوان ســـوار
واتــن نــەوەی شـا ئـەسپی تـۆ کـوشتەن
سـەرتا پـای تـەنش بـە هـون ئـاغشتەن
شـــا جـــە کـــوشتەنت نـەدارۆ دریـغ
جـەرگت وێـنەی ئـەو مـوشکاوۆ بـە تـێغ
دەر لا ئـەو جـوان هـور گـیلا جـە ڕەنگ
چـون سـەنگی سیاه مـاتەم بـی بـێدەنگ

وات یـــا ئـیلاهی هـیچ نـیەن عـیلاج
بە غـەیر جـە ئەعجاز شـای عـالی مـعراج
ئـەگـەر نـەجاتم مـن بۆم جـەی قـیتاڵ
مـەکـەرو مـەولود مـحمّد هـەر سـاڵ
بـەی تـەورە هـەر دەم مـەکـەروش نـیەت
جـە ڕۆحـی ڕەسـول مـەواسـتش هـیمەت
چون صدقش صاف بێ حەزرەت کەرد قەبوڵ
بـی بـە نـەجاتش حـەزرەتی ڕەسـول
بـەردشان حـوضور پـادشای عـادەڵ
موعجیزەی مـەولود خـەشمش کـەرد زائـیل
شـا، دیـا چـیهرەی پـاکـی ئـەو جـوان
مـدیۆ زەردبـیەن وێـنەی لیـمو وان
خـەشمش تـەبدیل بـی شـادیو بـەشارەت
واتش ئـەی جـوان صـاحب ئـیشارەت
مـن خـەشمی سـەختم تـەبدیل بـە مـێهرەن
ئـینە چـە فـەندەن کـەیدەن یـا سیحرەن
دەرسـاعەت لاشـیەبـیم ئـەو جـوان
چـون طـوطی فـەصیح ئـاماوە زوان
وات ئـەی شـا جـە سـیحر شـانم ئـازادەن
لەوحـم جـە نـقوش فـەند و فـێڵ سـادەن
وەلێ چـون زانـام سـەختەن تـەقصیرم
بـەستەی دام سـەخت قـەزاوتـە قـدیرەن
جەی تەنگانەی سـەخت هـیچ نـیەن عـیلاج
بـەغەیر جـە ئەعجاز شـای عـالی مـعراج

ئـــــاوردم نـــــە دڵ نـــــیەتی مـــــەولود
هەر ساڵ بکەرون هـەر چـەیم بـۆ مـەوجود
ئـــــەڵبەت خـــــوداون کـــەردەنش قـــەبوڵ
هـــیممەتش کـــەردەن حـــەزرەتی ڕەســـول
بـــــاقی والســـــلام بـــــە تـــۆن ئـــێختیار
بـــــازیم یـــــا بـــوشیم مـــن نـــەدار و چـــار
شـــــا، بـــۆسا گـــەردەن جـــوانـــی دڵـــبەند
ئازدا کەرد جـە هـون ئـەو شـیرین فـەرزەند
هـــەزار ئـــەشرەفی طـــەلاّ بـــەخشا پـــێش
تـــا کـــەرو مـەولود گـرد ســاڵێ پـەی وێش
مـوعجیزەی مـەولود پـاسەش کـەرد ئـیمداد
ئـــازاد بـــی جـە هـون ئـەو تـەنگانەی بـاد
صلوا علیه و سلموا تسلیما
یـــــۆتەر جــــە ئــەعجازمەولود ڕەســـول
شـــای قـــاب قـــوسَێن شـەفاعەت مـەقبوڵ
بـــیەن جـــەی وەرتـــەر جـــەوانـێ شـیرین
صـــاحب ســـەعادەت پـاکـیز و پـاک دیـن
حـــوببی مـــەولوودش ئـــەوەند بـــێ نـــەدڵ
دائـــــم و درهـــــەم نـــــمە بـــێ زائـــیڵ
وەخـــــــتێ کـــــە ئـــــاما ربـــیع الأول
تـــەدارەک مـەکـەرد ئـەو جـوان ئـەفضەڵ
مـــەجلس ئـــارای مـــەکـــەرد ئـــەو دڵبەند
جە نوقڵ و نـەبات جـە خـۆرما و جـە قـەند

مـــەدا بــە خــەڵکان طــەعام و کــەباب
گـۆناگـۆن ڕەنگ ڕەنگ فـرە و بـێ حسـاب
هەردەم بـە تـەورێ و بـە تـەرزێو عـەجەب
مـەولود مـەوەندەن بـە شـادیو طـەرەب
ســەراپـــای ئـــەو مـاه ربـيع الأول
مەکـەردش مـەولود مـوصطەفای مورسەل
یـانێ یـە هـودی بـێ جـە هـەمسایەش
سەرمایەش دەس کەوت یەهود جە سایەش
ژەنـی ئـەو یـەهود پـەر سـاجە شـوی وێش
واتش ئـی ئـەهلە کـەو تـێنی تـەشویش
هەر ساڵ ماوەران مەخلوقات صـەف صـەف
طـــەعامشان مـــەدان مـایەشان تـەلەف
نـمەزجـەی ضـەرەر نـەفعەشان چـێشەن
تـەمام جـەی خـەیاڵ خـاطەرم ڕیشـەن
شوش وات ئـی ئـێسلام دە سـورش پـاسەن
هـەرکەسەیو جـە سـەر دیـنی وێش ڕاسـەن
شــــەوی دوازدەی ربـــيع الأول
ئـــامان بـــە دنـیا ڕەسـوول ئـەفضەڵ
سـەراپـائەی مـاه کـەردە نشـان عـادەت
مـەکـەران مـەولود گـرد جـەو بـەشارەت
ئـــومێدشان هـــەن جـە ڕوی قـیامەت
پـــێغەمەر پـــەیشان کـەرۆ شـەفاعەت
ژەن وات بـە خـودا عـادەتشان خـاسەن
مـەعلومەن ئـەی دیـن دیـنێوی ڕاسـەن

ئەوژەن چەنی شویش هەردوشین نەخواب
ژەن دیش یەک شەخصێ جەماڵ چون ئافتاب
چون شوعلەی خورشید دیار دا جە دوور
جەبالآی سەرش مەزیو شەمعی نوور
ئەو نور چەنی عەرش پەیوەستەن بەهەم
جە دەورا دەورش فریشتەی ئەکرەم
گرد پاکیزە خوو سەر تا پا شیرین
گرد میسکین نەفس گرد جەماڵ نورین
گرد بە دەن لەتیف ڕۆح ئەفزای دڵکەش
گرد مەستی لەقای سەرا پای بێغەش
چون مای چواردە پڕ جە لەطافەت
نزدیک بێ وە نەش شەرەف و ڕەحمەت
چون شوعلەی ئافتاب وەختی بەیانی
جەماڵی حەزرەت بە میهرەبانی
سەرتا پای بالآش شانو شەرەفەن
صافی بێ سایە جە هەر طەرەفەن
ڕۆحەن ڕیحانەن باغەن جەننەتەن
وەهارەن گوڵزار فەزای ڕەحمەتەن
جە سەرتاوە پا سروشتەی نورەن
واسطەی سروشت غلمان و حُورەن
جە مینش یا جام صاف ئەنوەرەن
یا فەجری صادق نەجمی سەحەرەن
چون ژەن ئی جەماڵ شیرین دی بە چەم
جە نار حوبش بێتاو بێ دەردەم

پەرساش ئەی شەخصە کین نـامش چـێشەن
بـەیتەور جـە مـاڵش ڕیشـەی دڵکشـەن
واتشـان پـێغەممەر ئـاخەر زەمـانەن
مـحمد ئـەحمەد خـیرالأنـامەن
ژەن وات داخـۆ مـن ئـەر حـەرفێ چـەنەش
بـە پـەرس و یـانی سـەخت نـەیووە نـەش
واتشـان نـا یۆشـەخص خـولقش کـەریمەن
بـێ تـەککـەبورەن عـەطاش عـەمیمەن
هـەر چـی مـەپەرسی مـەدەرۆت جـەواب
هەم مەوزووت نە سەر ڕای خەیر و صـەواب
ژەن وات یـا ڕەسـول مـن فـیدای ڕات بـو
ڕووحم وە سـەرگەرد خـاکـی پـای ڕات بـو
ئـایا تـوجە مـن مـەکـەری قـەبوڵ
داخـڵ بـون بـە دیـن پـاکت یـا ڕەسـول
حـەزرەت فـەرماوا مـەقبوڵەن جـەلام
مـوشیۆم تـۆ، بـەینە ئـی دیـنی ئـیسلام
پـەنەت مـوژدەبۆ جـە ڕۆی قـیامەت
چـەنی ئـەوممەتم کـەروت شـەفاعەت
زانـام بـە ئـیخلاص تـۆمەینە، نـەدین
پـەوکایم ئـەرمانان جـە مـاڵی نـورین
کـەلیمەی شـادەت بـەو تـەعلیم کـەردش
شـەربەتی نـورین شـەهادەت وەردش
خـوشا بـە حـاڵش بێدار بـی جـە خـاو
جـە عـەشقی بـاڵای ڕەسـوول بـێ بـێتاو

بەیان کەرد پەی شویش ئەی خاوی شیرین
ئەویچ هەم بەیتەوردیە بێش یەقین
هەردوێشان دیسان هەم ئیمان ئاوەرد
ویشان جان فەدای رەسول الله کەرد
جەو دما هەر ساڵ جە وادەی مەولود
تەدارەک مەکەرد جە جنس ونقود
مەکەردەن مەولود سەیید سەروەر
سالار زومرەی رووی دەشتی مەحشەر
هەتا کە هەردوو وەفات کەردشان
جامێو جە شەربەت رەزاوەردشان
صلوا علیه و سلموا تسلیما
حتی تنالوا جنتا و نعیما

وەختێ خوداوەند پادشای ئەکبەر
کەرد ئیرادەی خەلق رۆح پێغەممەر
نورێ جە جەماڵ دڵ روبای ئەنفەس
جەویش جیا کەرد پادشای ئەقدەس
خولوقناش جەو نور روحی محمّد
صەلات و سەلام وە نەش بابێ حەد
بە تەدبیری وێش پادشای عەللام
ئەو نوری ئەنوەر کەرد بە سێ ئەقسام
خەلقش کەرد جە قسم ئەوەڵ شای لەولاک
باز چەنی ئەرواح ئالو بەیتی پاک

جــــە قســـم دووەم ئــەزواج و ئـــەصحاب
نەبی کەرد سروشت شـای ئـەقدەس جـەناب
جـــە قســم ســووەم ڕۆحــی مــوحبیان
نــەبێ کــەرد ســروشت پــادشای سـوبحان
دیســـان جــلوەکـــەرد ڕۆحـــی پـــێغەممەر
ســروشت بــێ ئــەڕواح ئــەنبیا یــەکســەر
جــەو دەم کــەرد سروشت پادشای ئـەحەد
بـــە قــودرەتی وێش ڕۆحـــی مــوحەممەد
هــیچ نــەبێ نــیشان جــە کــەون مــەکـان
جـــەلەیل و نـــەهار ئـــەمکنە و زەمـــان
نــەعەرش نــە کــورسی نـە خـۆ سـەماوات
نــە حــور نــە قوصور نە ئەنهار جـەننات
نــەصەوتی تــەسبیح جــەرگەی مـەلەکـووت
نــە نــاڵە نــالآی ئــی زومــرەی نــاسوت
نـە شـەرق ونـە غـەرب نـە شـەمس و قـەمەر
نـــە تــاثیری بــورج نــە زیــبی ئــەختەر
نــە صــەحنی بــاغان نــە فــەزای گــوڵاّن
نــە ســوزەی نــەوای نــەغمەی بــوڵبوڵاّن
نــە نــاز جــە مــەعشوق نـە عـاشق نـەیاز
نـە ڕەقـیبی چـەپ نـە خـەڵوەت نـە ڕاز
نـــە کـــوفر و عــیصیان نـەقبور نــەنار
نـــەبیم نـــە ئـــەومید نــە داد و هــاوار
نـە جــەفای خــەزان نــە سـەردی زمسـان
نـە صـەفای وەهـــار نــە گــەرمی تـاوسان

ئـەو سـا حـەق حـەزکەرد ڕۆحـی محمد
بـدەرۆش تـەرکیب هـەم چـەنی جـەسەد
دەرلا ئـەمرش کـەرد پـادشای مـەعبود
جـەمیعی ئـەجسام ئـاما ئـەو وجـود
ڕۆحـی مـوحەممەد کـیاست دلێشـان
تـا قـەبوڵ کـەرۆ جسـمی وێش لێشـان
نـە جـەمع زومـرەی ئـەجسام دڵـبەند
مـوحەممەد جسـم وێش کـەردش پەسەند
حـەق واتش پـەنە تـۆنی مـوجتەبا
ڕوح و جسـم و تـۆن نـامش مـوصطەفا
هـەرچـی جـە مـەوجود مـن ماروش پەدید
پـەی خـاترو تـۆ کـەروش ئـافەرید
مـەعلوم بـۆ جـەلات لولاک لولاک
بـە تـەحقیق لمـا خَـلَقْتُ اْلأَفْـلاک
پـەی ڕەزاجـوی وێـم گـردم کـەردەن خـەلق
مـن وێـم ڕەزای تـۆ جـا مـارو ئـەلحەق
جـەودەم ئـەمرش کـەرد بـە ئـەجسام دیسـان
گرد جـە عـیلمی غـەیب وٚیش مـەبی پـەنهان
ئـەوسا صـەد و چـل هـەزار ساڵ ویـەرد
ڕۆحـی مـحمد حـەمد و تـەسبیح کـەرد
دیسـان نـەظەر کـەرد جـهان ئـافەرین
وە ڕۆحـی ئـەنوەر ئـەعلای نـازەنین
پـەنج دفـعە بـەردش سـوجدەی ذاتـی حـەق
واجب کەرد پەنج فـەرز نـما، شـای مـوطلەق

ئــەو ڕۆحــی نــورین بـە ئـەمری قـودووس
ســوروشت بــی طــەیرێ بـەوێنەی طـاووس
جــە حــەیای حــوضور پــادشای ئـەکـبەر
عــەرەق کـەرد ئـەو ڕۆح سـەراپـا یـەکسـەر
جە ڕەشحەی فـەرقش خـەلقش کـەرد دەردەم
عــەرش چـەنی کـورسی لەوح چـەنی قـەڵەم
جە ڕەشحەی سـێنەش ئـەو پـاکـی سـروشت
ســروشت بــی ئــەرواح پــێغەممەران گشت
چــــەنی عــــولەما و صــــولەحا یـــەکســـەر
بــاز هــەم شــوهەدا و صــەحابەی ئــەنوەر
جە ڕەشحەی ظەهرش خەلق کەرد بەو دەسور
کــەعبەی مــوعەظظەم هــەم بـیت المـعمور
«بــــیت المـــــقدس» چـــــەنی مـــــزگیان
ئــــەنبیای کــــرام ســـروشت کــەرد دیســـان
جــە ڕەشــحەی نـورین حـاجبش دەرسـات
خـــــەلق بــــی مــؤمنین چــەنی مــؤمنات
جـــــە ڕەشـــــحەی بــالاش ربّ العــالمین
خــەلقش کــەرد مـەخلوق ئـاسمان و زەمـین
صـــــــلوا عـــــليه و ســــــلموا تســــــليما
حــــــــتی تـــــــنالوا جـــــــنتا و نـــــعیما

هەم ئیمام علی کەردەن ڕیوایەت
جەو دما خالق صاحب عەظمەت
دوازدە حیجاب خەلق کەرد دەر ساعەت
ئەوەڵ خولقونا حیجاب قودرەت
پەردەی عەظەمەت حیجاب مینەت
حیجاب ڕەحمەت پەردەی سەعادەت
پەردەی مەنزەڵەت پەردەی هیدایەت
پەردەی نوبووەت حیجاب ڕەفعەت
حیجاب تاعەت پەردەی شەفاعەت
سورشت کەرد یەک یەک بە قووەی قودرەت
جە پەردەی قودرەت دوازدە هەزار ساڵ
تەسبیحاتش کەرد ئەو شیرین جەماڵ
تەقدیس کەرد پەی ذات باری تەعالا
مەوات (سبحان ربّی الاعلا)
یازدە هەزار ساڵ ئەو ساحب حیشمەت
تەسبیح کەرد نەتۆی پەردەی عەزەمەت
مەوانا دەم دەم ئەو ساحب سەفا
(سبحان عالمِ سرٍّ و اَخْفا)
هەم دە هەزار ساڵ ئەو ساحب دەوڵەت
(تسبیح) وەند نەتۆی پەردەی مەعریٚفەت
مەوات (سبحان الرفیع الأعلی)
یا ڕەبّی ڕەفعەت هەر پەی تۆن ئەولا
هەم نۆ هەزار ساڵ ئەو ساحب مینەت
تسبیح کەرد نەتۆی حیجاب ڕەحمەت

مـــوات (ســـبحان الروف الرحـــيم)

هــەر لایـق بـە تـۆن تـەعزیم و تـەکـریم

باز هەشت هەزار ساڵ ئەوذی کـەرامـەت

(تســبیح) کـەرد نـەتۆی حـیجاب تـاعەت

هـــەر دەم مـــەوانـــا (تســـبیح) مـــەقبوڵ

(ســـــبحان مَـــنْ دائمٌ لا یـــزول)

هەم هەفت هـەزار سال ئـەوشای نـبووەت

(تسبیح) کەرد نە تۆیپەر دەی مـەعرێفەت

ســـبحان ذی المـــلک (هـــەم) مَـلکوت

ئـــادەن پـــادشای حـــەییی لا یـــەموت

هـەم پـەنج هـەزار سـاڵ شـای ذوالعـنایت

(تسبیح) وەنـد نـەتۆی پـەردەی هـیدایـەت

مـەوانـا هـەردەم بـە فـەزڵ و تـەکـریم

(ســـبحان ربّ ذی العـــرش العـــظیم)

هەم چوار هەزار سـاڵ شـای ذی فـتووەت

(تسبیح) وە نـد نـەتویٚ حـیجاب ڕەفـعەت

هـــەر دەم مـەوانـا شـای سـاحب نـاموس

(ســـبحان الله المـــلک القـــدوس)

هەم دو هەزار ساڵ هـەردەم هـەر سـاعەت

(تسـبیح) وە نـد نـەتۆی حـیجاب تـاعەت

هـەردەم مـەوانـا سـەییدی مـەسعوود

(ســـبحان الله المـــلک المـــعبود)

ئەوسا ڕەفعش کەرد شای ساحب قـودرەت

نـووری مـحمّد لای بـەحری ڕەحـمەت

قــەڵەم عــەرزش کـەرد پـادشای ئـەجەڵ
من چـێش بـنویسـو وە ڕوی لەوح ئـەوەڵ
فــــــەرما ئـــــــەوەڵ لا الە الا اللە
دووەم مـــــحمد هـــەم ڕەســــول اللە
دەرساعەت قـەڵەم نـاڵا و شـیی جـەهۆش
جە شادی ئەو ئیسمە قـەڵەم بـی خـامۆش
سەد ساڵ بـی بـێهۆش قـەڵەم بـە یـەکجار
جـە خــاوی شـیرین ئـەوسا بـی بـێدار
وات یا ئـیلاهی مـەولای تـەحت و فـەوق
من سۆتا، بە تاو نـووری سـەودای عـەشق
مــەعلومەن کـە تـۆی فـەردی بـیّ مـانەند
بـیّ تـاتە و ئـەدا بـیّ ژەن و فـەرزەند
(واحـــــد لَمْ یَـــلِدْ) هـــەم وە لَمْ یـُولَدْ
لَمْ یَکُـــــنْ لَهُ کُـــــفواً اَحـــــدَ
هـــەم حــەیی قـــەییوم بـێلازەوالی
واحـــد لا شــەریک شــای ذوالجــلالِ
ئـــەمما مـــەزان و مــن مـحمد کـێن
نـــامش چــەنی نـام تـۆبیەن قـەرین
حــەق وات یـــا قــەڵەم بـە ذاتـی قـەدیم
هـەم بـە عـیزەت و ذوالجـەلالی وێـم
بـــە یـەکـتایی وێـم واحـد و ئـەحەد
ئـــەگـــەر نـــەمەبیّ ڕۆحــی مـحمّد
نەعەرش نە کـورسی نـە جـەننەت نـە نـار
نـە ئـەرز و سـەما نـە لەیـل و نـەهار

نــە بـیم نـە ئـومێد نـەگـەرم و نـە سـەرد
هــیچ مـا سـیوای وێـم خـەلقم نـمەکـەرد
پـەی خـاتری ئـەو گـردم کـەردەن خـەلق
سەراپای عـالەم جـە تـەحت تـا بـە فـەوق
باز دیسان قـەڵەم بـی مـەست و مـەدهۆش
جـــە شــیرینی نــام مــحمد خــامۆش
دیســـان بــێدار بـــی بـــە ئـەمری ئـەحەد
ئـەمرش کـەرد سـەلاّم کـەڕەوە مــحمّد
جــیاتی مـەحبوب جـەواب سـەندەوە
فـــەرزی جــەوابش پــەیمان مـەندەوە
دیســـان ئــەمرش کـەرد نـویستش قـەڵەم
هەرچـی وجـود ئـارد جـە کـونهی عـەدەم
پـــەرێ مـــوتیعان نـوسیش جــەننەت
دوزەخ نـــویسیا پـــەی ئـەلی مـەعسیەت
چــــون یـاواوە لای ئـەوممەت مـحمد
ئـیلهام کـەرد وە نـەش پـادشای ئـەحەد
بــــنویسە امّـــةٌ(هـــەم)مـــذنبةٌ
و رَبٌ غـــــفورٌ تـــــلک آیَــــةٌ
صــــلوا عـــلیه و ســـلموا تســـلیما
حـــــتی تـــنالوا جــــنتا ونـــعیما

نـــەزەر کـــەردەن نـــوور پـــاکـــی مـــحمّد
صـــەلات و ســـەلام وە نـەش بـان بـیٚ‌حەد
ئەو نـور مـەدرەوشا چـون شـەمس و قەمەر
ئـــەوان شـــوعلـیّون جـــەو نـــور ئـــەنوەر
چوار ئەنگوشت ئادەم جەو نور شوعلە سەند
مەدرۆشان یەک یەک ڕەگ ڕەگ و بـەندبەند
ئـــــادەم وات ئـــــینە مـــــحمد نـــــامەن
یـــا ڕەب ئـــەو چـــوارە مـــەزانـــو کـــامەن
وات ووســـــتا «بـوبەکـر» بـیٚنسەر عـومەرەن
خـــــینسەر عـــوثمانەن ئـــیبهام حـــەیدەرەن
بـــــزانـــە هـــەر چـــوار یـــاری ڕەســـولەن
جـــەلای خـوداوەنـد هـەر چـوار مـەقبوڵەن
جـــەو دمـــای ئـــادەم بـــە ئـیٚغوای شـەیتان
گـــەندوم وارد بـــەرشی جـەڕەوڵەی جـینان
ئـــەو نـــوور ئـــەعزەم بـەرشی جـەموشتش
نـــەقڵ کـــەرد لوانـــە حـــوجرەی پـــەشتش
ئـــــادەم و حـــــــەووا ئـــامان بـــە زەمـــین
ســـیٚ ســـەد ســـاڵ زاری کـەردەن بـە غـەمین
وەخـــــتیٚ هـــەر ســـانش مـــەڕیٚزان بـــەوار
مـــــەویەردەن زەمـــــین بـــەوڵێنەی ئـــەنهار
جـــــەهەرساتیٚ ئــــەو مـیٚوە و نـــەباتات
خـالەق کـەردش سـەوز پـەریٚ مـەخلوقات
ڕویٚ و جـــــە ســـــــوجدە مگـــرەوا بـــەزار
جە دەرگـای بـیٚ چـوون حـەیی کـەرەمدار

دیش جــه ساقی عـەرش پادشای ئـەحەد
نــــــویسیان (الله رەســــول مـــحمّد)
ئـــادەم یـــا ڕەب بـــه عـــەشق مـحمّد
بـــبخشی گـــونام واحـــد و ئـــەحەد
جـۆش دا، دەریـای ڕەحـم جـیهان ئـافەرین
جـــوبیریلی ئـــەنوەر كـــیاست ڕوی زەمـین
فــەرما یــا ئــادەم ســەر هـوردە نـەخاک
خـــالەق تـــۆش بـــەخشا بـــه شاه لەولاک
بـــه شـــەرافــەتی مـوستەفای مـــوختار
خـــالق تـــۆش بـــەخشای بیەی ڕەستگار
هـــــەر كـــەس مـــەوانـــو نـــامی مـحمد
یاڕەب تـۆ بـەخشیش ئـەر نـیكەن ئـەر بـەد
خــــودای فــەرما وا تـــەنها نــەفسی وێت
جێمەت تـەڵەبكـەرد ئـێمەیچ بـەخشا پـێت
ئـــەگـــــەر مـــــەواتت تـــەمام گـــوناباز
مــەخلوقم بــەخشا بــه شــاهی مـــوختار
صلوا علیه و سلموا تسلیما
چـــون كـــەرد ئـیرادە قـەییوم ئـەكـبەر
بكـــــەرو زاهـــر نـــوری پــێغەمەرﷺ
بـابەش عـبدالله عـەزمش بـی مـەحكەم
تـا پـەیدا كـەرۆ هـام جـوفت هـەم دەم
وات بە ئـەدای وێش ژەنــێو بـاكـەماڵ
حەسیب و نەسیب هەم ساحب جـەماڵ

قـورەیشی عـەرەب جـە ئـەقرەبای وێـم
بـە سـەد عـیزز و نـاز بـاوەردێ پـەرێم
ئەدایش وات فرزەند بەدیدە و بـە گـیان
(بـالرأس و العـین) جـا مـارو فـرمان
هــور ئــێزا وە پـا چـا در کـێشا سـەر
گــیلاّ ئــەقرەبای قــورەیش سـەراسـەر
نـەزەر کـەرد ژەنـان کـنا چـەی دڵـبەند
هیچکام چـەی خـاتـر نـمەبیٚ پـەسەند
ئــیللا ئــامینە کــناچەی وەهــەب
(بــن عــبدالمـناف) قـورەیشی نـەسەب
حـوسنا و نــازەنین مــاقوڵی ئــەنوەر
مەدرەوشا چون شەوق ستارەی سەحەر
بـــنا بـەـ تـەقدیر حـەی ڕەبـبانی
ئــیجابەت کــەردەن بــە شــادومانی
چـل مـثقاڵ نـوقرە چـل مـثقاڵ تـڵاّ
داشـان بـە مـارەی چـەنی چـەند کـاڵاّ
صەلات وسـەلام چـون دانـەی گـەوهەر
لێت بـۆ یـا ڕەسـول شـافعی مـەحشەر
صـــلوا عـــلیە و ســلموا تسـلیما
حـــتی تـــنالوا جـــنتا و نـــعیما

